# لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا

ناوی کتێب: لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنییەکدا
بابەت: ڕۆمان
نووسەر: یۆستاین گاردەر
وەرگێڕانی لە دانیمارکییەوە: بەهرۆز حەسەن
تیراژ: 2000 دانە
ژمارەی سپاردن: (560)ی ساڵی 2006ی دراوەتێ
بەرگ: سالار مەجید
نۆرەی چاپ: یەکەم
نرخ: 3000 دینار
چاپ و بڵاوکردنەوەی: چاپخانەی ڕەنج


دەقە کوردیەکە پێشکەشە بە خوێنەرانی گاردەر و بەتایبەتی پێشکەشە بە هەموو ئەوانەی کە کەمێک زیاتر لە ژیان و مردن ڕادەمێنن...
بەهرۆز حەسەن

دەرگای دالانەکەیان بەکراوەیی بەجێهێشتبوو. لە قاتی خوارەوەوە بۆنی جەژنی ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح دەگەیشتە سەرەوە بۆ لای 'سیسیلیا'. ئەویش دەیویست بۆنەکان لەیەکتری جودا بکاتەوە.
بۆنی کەلەرمی ترش ناو ماڵەکەی تەنیبوو. بۆنی بوغوردیش دەهات، ڕەنگە بەرلە ڕۆیشتنیان بەرەو کڵێسە باوکی خستبێتیە ناو ئاگردانەکەوە. بەڵام بڵێیت بۆنی دار سنەوبەرە تەڕوبڕەکەش نەکات؟ سیسیلیا دیسانەوە هەناسەیەکی هەڵکێشایەوە. هەستیدەکرد بتوانێت بۆنی دیاریەکانی ژێر دار سنەوبەرەکە بکات، بۆنی ئەو کاغەزە سور و ئاڵتونیە بریقەدارانە بکات کە دیاریەکانیان پێ پێچاوەتەوە، بۆنی ئەو کارتانەی سەر دیاریەکان بکات کە لێیان نوسیبوو لە فلانەوە بۆ فیسار و بە پەتێکی ئاوریشم ئاسا قردێلەیەکیان لێدابوو. بەڵام بەدەر لەوانە بۆنی شتێکی تریش دەهات_ بۆنی شتێکی نادیاری ناوازە و ئەفسوناوی دەهات. ئەو بۆنەش بۆنی جەوی جەژنی لەدایکبوونی مەسیحبوو.

هەروا لەگەڵ بۆنکردندا پەنجەی دەهێنا بەسەر پەنجەرەکانی ڕۆژ ژمێرەکەی[1] سەر جێگاکەیدا. هەر 24 پەنجەرەکەی کرابووەوە. ئەمڕۆ گەورەترینیانی هەڵدابووەوە. هەمدیسان تەماشایەکی فریشتەی ناو وێنەکەی کردەوە، لەو وێنەیەدا مەسیح تازە لەدایکبووە و لە لانکێکدا دانراوە، فریشتەکەش بەسەر ئەو لانکەدا چەماوەتەوە. ماریا و یوسفیش لە پاشینەی وێنەکەدا وەستاون و بەتەواوەتی وا دێتە بەرچاو کە ئاگایان لەو فریشتەیە نەبێت.
تۆ بڵێیت بەڕاستی کاتی خۆی ئەو فریشتەیە لە گەوڕەکەدا بووبێت و ماریا و یوسف نەیانتوانیبێت بیبینن؟
سیسیلیا بەچواردەوری خۆیدا سەیرێکی ژورەکەی کرد. ئەو چەندەها جار لە گلۆپە سورەکەی بن سەقفەکە وردبووبوەوە. گەلێ جار سەرنجیدابووە پەردە سپیەکەی کە بەنەخشی گوڵی 'لەیادم مەکە' ڕازێنرابووەوە. چەندەها جار تەماشای کتێبخانەکە و کتێبەکانی ناوی و بووکەکانی کردبوو. سەدان جار سەیری کریستاڵەکان و خشڵ و بەردە بەنرخەکانی کردبوو، ئەو لەڕادەبەدەر سەیری ئەو شتانەی کردبوو، بگرە دواجار وەک بەشێکی ئەویان لێهاتبوو. لەسەر مێزی نوسینەکەی بەردەم پەنجەرەکەدا دەلیلێکی گەشتوگوزاری دورگەی 'کریتا' لەتەنیشت کتێبێکی کۆنی ئینجیلی منداڵان و ئەفسانەی خواکانی 'سنۆرە'وە دانرابوو. بەو لا دیوارەشەوە کە ڕووی لە ژوری نوستنی دایک و باوکی بوو، ڕۆژ ژمێرێکی یۆنانی هەڵواسرابوو و چەندین وێنەی جوانی پشیلەی لەسەربوو. هەر لەسەر هەمان بزماریش ئەو ملوانکە مرواریە کۆنەی هەڵواسیبوو کە نەنکی پێی بەخشیبوو.

---

[1]ڕۆژ ژمێرێکە تایبەتە بە مانگی دوانزە و جەژنی لەدایکبوونی مەسیح.. لاپەڕەیەکی گەورەیە و بەوێنەی تایبەت بەو جەژنە ڕازاوەتەوە، لە یەکی مانگەوە تا 24ی مانگی تێدایە (واتە تا ڕۆژی لەدایک بوونی مەسیح) و زیاترێک بۆ منداڵانە و زۆرجار لەژێر هەر ژمارەیەکدا کە هەڵی دەدەیتەوە پارچەیەک شوکلاتەی تێدایە، ژمارە بیست و چوار لە هەموویان گەورەترە. و

چەند کەڕەت ئەو 27 ئەڵقەیەی پەردەکانی ژماردبوو؟ بۆچی لەلایەکدا سیانزە دانە و لەلاکەی تردا چواردە ئەڵقەی پێوەبوو؟ چەند کەڕەت هەوڵیدابوو ژمارەی گۆڤارە زانستیەکانی ژێر مێزی نوسینەکەی بژمێرێت؟ هەموو کەڕەتێکیش کە دەستیدەکرد بە ژماردنیان، ناچاردەبوو دەستی لێهەڵگرێت، چونکە لەسەریەک کەڵەکە کرابوون. دەستی لە ژماردنی وێنەی گوڵەکانی سەر پەردەکانیش هەڵگرتبوو، چونکە هەمیشە گوڵێکی "لەیادم مەکە" خۆی لە نێوان لۆچەکاندا دەشاردەوە.

دەفتەری یاداشتنامە "چینی"یەکە لەژێر جێگەکەیدا بوو. سیسیلیا کەوتە دەست کوتین.. ئەوەتا، ماجیکەکەشی دۆزیەوە.

ئەو دەفتەرە بە بەرگێکی قوماش داپۆشرابوو و کەڕەتێکیان یەکێک لە پزیشکەکانی خەستەخانەکە پێی بەخشیبوو. کاتێک دەفتەرەکەی بەرزدەکردەوە و دەیخستە بەر ڕۆشناییەکە، ڕەنگی ڕەش و سەوز و سوری پەتە ئاوریشمیەکە دەبریسکایەوە.

هێندە تاقەتی نەبوو یاداشتەکانی بنوسێت، زۆر شتی واشی نەبوو تا لەسەریان بنوسێت. بەڵام لەلای خۆیەوە بڕیاریدابوو لەو کاتانەدا کە پاڵدەکەوێت و بیردەکاتەوە، وەک تێبینیەک هەموو ئەو خەیاڵانە بنوسێتەوە کە بە مێشکیدا دێن و دەچن. پەیمانیشی بەخۆی دابوو بەهیچ شێوەیەک هیچ وشەیەکی نوسینەکانی ڕەش نەکاتەوە، دەیویست هەموو وشەیەکی بۆ هەتاهەتایە بمێنێتەوە. بێگومان کاتێک گەورەدەبێت و نوسراوەکانی ناو یاداشتەکەی دەخوێنێتەوە، هەستێکی سەیری پێدەبخشێت. بەخەتێکی گەورە لەسەر یەکەمین لاپەڕە نوسیبووی "تێبینیە تایبەتیەکانی سیسیلیا سکۆتبو".

دیسانەوە سەری بەتەواوەتی نوساندەوە بە سەرینەکەیەوە، دەیویست گوێی لە دەنگێک لە دەنگەکانی خوارەوە بێت. گوێی لێبوو تاوناتاوێک دایکی لە چێشتخانەکەیاندا دەستی بەر کەوچک و چەتاڵ و چەقۆکان دەکەوت، جگە لەو تەقەتەقانە ماڵەکە سەرتاپا کش و مات بوو..

کاتی خۆیبوو ئەوانیتر لە کڵێسەوە بگەڕێنەوە و هاکا دەبوایە پەیدابوونایە. ڕەنگە ڕێک لە پێش (یان ڕێک لەدوای) زەنگی

دەستپێکردنی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح بێنەوە. لە "سکۆتبو"شەوە زۆر بەڕونی گوێیان لە زەنگی کڵێسەکان دەبوو. زۆرجار دەچوونە سەر پلیکانەکانی دەرەوە بۆ ئەوەی گوێیان لە زەنگەکان بێت.
ئەو جەژنە سیسیلیا نەیدەتوانی بچێتە سەر پلیکانەکانی بەردەرگای ماڵەکەیان و گوێ بۆ زەنگی دەستپێکردنی جەژن بگرێت، چونکە نەخۆش کەوتبوو.. نەخۆشیەکی سوکیشی نەگرتبوو، بەڵکو بەدرێژایی مانگی دە و یانزەش هەر نەخۆشبوو. سیسیلیا هەر زۆر خراپ نەخۆش کەوتبوو، لەبەرئەوە جەژنی لەدایکبوونی مەسیح بەلایەوە وەک ئەوە وابوو چنگێک لم بێت و لەکاتی خەودا یان زیندەخەودا لە نێوان پەنجەکانیەوە بترازێت و ون بێت. بەڵام لایەنی کەم لە خەستەخانە نەکەوتبوو. لەوێ هەر لە سەرەتای مانگی دوانزەوە دەستیان بەڕازانەوەی تایبەت بەو جەژنە کردبوو.
باشبوو ساڵی پار جەژنی لەدایکبوونی مەسیحی بینی. سیسیلیا پێی وابوو جەژنی لەدایک بوونی مەسیح لە 'سکۆتبو'دا تەنها شتێک بێت کە لە هەموو جیهاندا گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک خەڵکی ساڵ لەدوای ساڵ کتومت کۆمەڵێک شتی دیاریکراو و دەقگرتوو دوبارەدەکەنەوە و قەتیش بیر لە هۆکاری کارەکەیان ناکەنەوە. هەموو ڕونکردنەوەیەکیشیان تەنها ئەوەیە کە گوایە دەڵێن "ئاخر دابونەریتی جەژنەکە خۆی وایە".
چەند ڕۆژی پێشوو دەیویست تەواوی ئەو شتانە بزانێت کە لە قاتی خوارەوە ڕویاندەدا. تەقوهوڕی دروستکردنی ئیشی هەویر و ڕازادنەوەی ناوماڵ هەروەکو دەنگی چەند بڵقێکی بچکۆلەی قوڵایی ئاوێک دەگەیشتنە سەرەوە. هەندێ جار سیسیلیا وا دەهاتە بەرچاوی کە قاتی خوارەوە زەوی بێت و خۆشی لە ئاسماندا بێت.
دوێنێ ئێوارە دار سنەوبەرەکەیان هێنایەوە و دوای خەوتنی "لاس"یش، باوکی دەستیکرد بە ڕازاندنەوەی. سیسیلیا هێشتا نەیبینیبوو. تا ئەو کاتە دار سنەوبەری تایبەت بەو جەژنەی نەدیبوو! شتێکی باشبوو کە برایەکی بچکۆلەی چەنەبازی هەبوو. هەموو ئەوانی تر تەنها تەماشای شتەکانیان دەکرد یاخود بیریان

لێدەکردەوە و تەواو، بەڵام ئەو هەر دەبوایە قسەیەکی لەسەر هەموو شتێک بگوتایە. بەو جۆرەش زۆر بەتێروتەسەلی باسی هەموو ئامادەکاری و ڕازاندنەوەی ئەو جەژنەی بۆ دەگێڕایەوە. ئەو لە جیهانی قاتی خوارەوەوە پەیامنێری نهێنی سیسیلیا بوو.

لەسەر تەپڵەکە بچکۆلەکەی تەنیشت جێگاکەیەوە زەنگێکیان بۆ دانابوو. سیسیلیا ئەو کاتانە زەنگەکەی لێدەدا کە بیویستایە بچێتە تەوالێت یان پێویستی بە شتێک ببوایە. زۆربەی جارەکان 'لاس' یەکەم کەسبوو کە خۆی دەگەیاندێ. هەندێ جار تەنها بۆئەوە زەنگی بۆ لێدەدان تا بزانێ چ جۆرە شیرینیەکیان دروستکردووە یان دەیویست بزانێت بە چ شێوەیەک ماڵەکەیان ڕازاندۆتەوە.

باوکی پەیمانیدابوو لە کاتی کردنەوەی دیاریەکاندا بەباوەش هەڵیبگرێت و بیباتە خوارەوە. ئاواتیبوو جوتێ پێڵاوی درێژی تایبەت بە خلیسکێنەی سەری بەفری بەدیاری بدەنێ. پێڵاوە کۆنەکانی بچکۆلەبووبوونەوە. دایکی پێشنیاریکردبوو خلیسکێنە و ئەو شتانە وازلێبهێنێت تا بەتەواوەتی چاک دەبێتەوە، بەڵام سیسیلیا پێشنیارەکەی بەدڵ نەبوو. ئەو دەیویست لەجەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا پێڵاوی خلیسکینەی سەربەفری بەدیاری بدەنێ و تەواو!

_ سیسیلیا، دڵنیانیم کە ئەم زستانە بتوانیت خلیسکێنەی سەر بەفربکەیت.

گوڵدانێکی پڕلەگوڵی فرێدایە سەر زەویەکە.

_ بەهەرحاڵ هەتا پێڵاوی خلیسکێنەم نەبێت، ناتوانم لەسەر بەفر خلیسکێنەبکەم.

دایکی بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێکبدات، گسکێکی هێنا و کەوتە کۆکردنەوەی ئەو ناوە. لەو کاتەدا کە پارچە شوشەکان و گوڵەکانی گسکدەدا وتی؛

_ وامزانی زیاتر حەزت لەشتێکی خۆشە کە بتوانیت لەسەر جێگاکەت خۆتی پێوە خەریک بکەیت.

قسەکەی دایکی سەری ئێشاند. "لەسەر جێگاکەە!" ئینجا قاپێک و پەرداخێک شەربەتی فڕێدایە سەر زەویەکە. دایکی هێشتا هەر توڕە نەبوو، بەڵکو هەر گسکی دەدا و پەیتا پەیتا شتەکانی کۆدەکردەوە.
دواتریش سیسیلیا زیاترێک لەسەر قسەکانی سوربوو و هەروا بۆ دڵنیایی وتی "حەزم لە تاخورک[1] و پێڵاوی سەر سەهۆڵێشە"..
هەر لەسەرەتای مانگی دوانزەوە سەرماوسۆڵی زستان دەستی پێکردبوو. چەند جارێک سیسیلیا هەرخۆی بەسکەخشێ لە جێگاکەیدا هاتبووە دەرەوە و بەلەرزەلەرز خۆی گەیاندبووە لای پەنجەرەکە. بەفر بەچەشنی لێفەیەکی نەرم خۆی بەسەر داروبەردی بەستووی دەرەوەدا دابوو. باوکی گڵۆپی وردی ڕەنگاوڕەنگی کردبوو بە دار سنەوبەرە گەورەکەی باخچەکەوە و دایگیرساندبوون. ئەوەشی هەر لەبەرخاتری ئەم کردبوو. ئەوان هەمیشە ئەو گڵۆپانەیان بە دارسنەوبەرە بچکۆلەکەی بەردەم دەرگای دەرەوەدا هەڵدەواسی. لەدورەوە لەنێوان لقەکانی دار سنەوبەرە گەورەکەوە بەحاڵ ڕۆشناییەکی کەمی 'ڕاونەکۆلن'ی دەهاتە بەرچاو.
قەت لەوەوپێش لە ڕۆژانی بەر لە جەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا سروشتی دەرەوە ئاوها ڕون و ئاشکرا دیارنەبووە. کەڕەتێکیان سیسیلیا پۆستەچیەکەی بینی بەخۆی و پاسکیلەکەیەوە بەرەو ئەو ناوە دەهات، هەرچەندە ئەو ڕۆژە پلەی گەرما دە پلە لەژێر سفرەوەبوو و دونیایەک بەفری نوێ لەسەر شەقامەکان کەڵەکەبووبوو. لەپێشدا خەندەیەکی بۆ خستە سەر لێوانی. ئینجا دەستێکی کێشا بە پەنجەرەکەدا و دەستی بۆ ڕاوەشاند. پیاوی پۆستەچیەکەش هەردوو دەستی بۆ ڕاوەشاندەوە و پاسکیلەکەی هەڵخلیسکایە ناو بەفرە نەرمەکەوە. هەر لەدوای ئەوەی کە لە پشت کادانەکەوە دیارنەما، سیسیلیا بەسکەخشێ خۆی گەیاندەوە جێگاکەی و دەستی کرد بە گریان. هەروەک ئەوەی مانای ژیانی لەو پۆستەچیە پاسکیل سوارەدا بینیبێ کە بەناو ئەو بەفری زستانەدا تێدەپەڕی.

[1] تاخورک: گالیسکەی بچکۆلەی بێ تایە کە بەسەر بەفردا ڕادەکێشرێت.و

جارێکی تریش هەر لەلای پەنجەرەکەوە وەستابوو و فرمێسک بەچاوانیدا هاتە خوارەوە. چونکە زۆر حەزیدەکرد ڕابکاتە ناو بەفرەکەوە. لەبەردەم دەرگای کادانەکەدا دوو سێرە[1] لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر فڕک و هوڕیانبوو و سەقاڵی گەمەیەکی مەکراویبوون. سیسیلیا پێکەنی، لەوێدا زۆری پێخۆشبوو کە ئەویش سێرەیەک بوایە. بەڵام هەستیکرد پێڵوی چاوی تەڕبووە. دواتریش بە پەنجەیەکی فرمێسکێکی سڕی و لەسەر پەنجەرەکە وێنەی فریشتەیەکی پێکێشا. کە بۆشی دەرکەوت بە فرمێسکی خۆی وێنەی فریشتەیەکی دروستکردووە، دیسانەوە دەستیکردەوە بە پێکەنین. بەڕاست جیاوازی نێوان فرمێسکی فریشتە و فریشتەی فرمێسک چیە؟

لەوە دەچوو خەوی لێکەوتبێت، چونکە لەپڕێکدا دەنگی دەرگاکەی دەرەوە ڕاچڵەکاند.

لە کڵێسەوە گەڕانەوە! سیسیلیا گوێی لێبوو کە بەفریان لە خۆیان دەتەکاند. تۆ بڵێیت گوێی لە زرنگەی زەنەگەکانیش نەبووبێت؟

_ جەژنت پیرۆزبێت دایە!

_ جەژنی تۆش پیرۆزبێت کوڕەکەم.

_ جەژنی تۆش پیرۆزبێت 'تۆنە'.

باپیرە قوڕگێکی بۆ پاککردەوە و وتی؛

_ بەڵێ، ئێرە بۆنی ئاهەنگی جەژنی لێدێت.

_ 'لاس'، ئادەی پاڵتۆکەی داپیرە هەڵواسە.

سیسیلیا پێیوابوو بیانبینێت. داپیرە خەندە گرتبووی و باوەشی بە هەموویاندا دەکرد، دایکی لەو کاتەدا کە باوەشی بە باپیرەدا کرد، پاڵتۆ سورەکەی داکەند، باوکی دەستی هێنا بەسەری 'لاس'دا، باپیرە سیگاریکی پێکردبوو..

لەو دوادواییەدا سیسیلیا لەشتیکی دیاریکراودا زۆر زیرەکتربووبوو، ئەویش ئەوەبوو کە دەیتوانی بە گوێچکەکانی شت ببینێت.

---

[1] سێرە؛ جۆرە مەلێکە لە چۆلەکە دەچێت.و

چرپەچرپێکی هێواش دەنگەدەنگ و هەراوهوریای قاتی خوارەوەی شکاند. کەمێک پاش ئەو بێدەنگیە باوکی بە پلیکانەکاندا سەرکەوت. چوارچوار و پێنج پێنج پلیکانەکانی دەبڕی.

_ جەژنت پیرۆزبێت سیسیلیا!

باوەشێکی پێداکرد و بەهێواشی نوساندی بەسنگیەوە. کەمێک دواتر بەئەسپایی هاتەوەدواوە و پەنجەرەکەی خستە سەر گازی پشت.

_ گوێت لێیە؟

سیسیلیا سەری لەسەر سەرینەکەی بەرزکردەوە و سەرێکی بۆ لەقاند.

_ کەواتە کاتژمێر پێنجە.

پەنجەرەکەی داخستەوە و لەسەر قەراغی جێگاکەی دانیشت.

_ پێڵاوی خلیسکێنەی نوێتان بەدیاری بۆ کڕیوم یان نا؟

پرسیارەکەی بەشێوەیەک کرد کە هەر لەوەدەچوو ئاواتەخوازبێت باوکی بڵێت نەء. ئەو کاتە دیسانەوە دەیتوانی تورە ببێتەوە، ئەو پێی باشتربوو کە تورەببیت وەک لەوەی هەروا دڵی تەنگ بێت.

باوکی پەنجەیەکی خستە سەر دەمی.

_ بەشێوەیەکی تایبەتی مامەڵەی کەس ناکەین سیسیلیا. تۆش وەک ئەوانی تر چاوەڕوانبە و بزانە چی بە دیاری وەردەگریت.

_ وابزانم جگە لە چاوەڕوانی چارێکی ترم نیە.

_ بەڕاستی لەکاتی نانخواردندا ناتەوێت لەسەر قەنەفەکەی خوارەوە پاڵکەویت؟

سەری بۆ ڕاوەشاند. لەڕۆژانی پێشوودا گەلێ جار باسی ئەوەیان کردبوو. وا باشتربوو تا کاتی دیاریەکان پشووبدات، خۆ ئەو هەر نەیدەتوانی هیچ شتێک لە خواردنی ئەو جەژنە بخوات، چونکە گەر بیشیخواردایە دەیهێنایەوە.

_ بەڵام دەبێت هەموو دەرگاکان بە کراوەیی بەجێبهێڵن.

_ بێگومان!

_ وە دەشبێت بەدەنگی بەرز قسەبکەن... و لەسەر مێزی نانخواردن تەقوهوڕێکی زۆرتان لێبەرزبێتەوە.

_ هەر واش دەبێت.

_ دوای ئەوەی کە خۆتان ئینجیلتان خوێندەوە، با نەنکم بێتە سەرەوە و بۆم بخوێنێتەوە.
_ لەوەوپێش لەسەر ئەوەش ڕێک کەوتبووین.
سەری لەسەر سەرینە گەورەکەدانابوو و سەیری خوارەوەی دەکرد و وتی؛
_ بەیارمەتیت ئەو 'هێدفۆن'ەم دەدەیتێ؟
باوکی چووە لای کتێبخانەکەوە و لەسەر ڕەفەیەکی هێدفۆن و کاسێتەکەی دایە دەستی.
_ ئیتر خۆم دەتوانم ئەوانی تر بکەم.
باوکی ماچێکی ناوچەوانی کرد و بەچرپەیەک وتی؛
_ من بەلامەوە خۆشترە لێرەدا لەگەڵ تۆدا دانیشم. بەڵام وەک دەزانیت خەڵکی تریشی لێیە. من خۆم وام پێ باشە لە ئێستا بەدواوەی جەژنەکە لێرەدابم.
_ من وتم 'دەبێت بەشێوەیەکی ئاسایی جەژنی خۆتان بکەن'.
_ بەڵێ، بەشێوەیەکی ئاسایی دەیکەین.
باوکی بەهێواشی ڕۆیشتە دەرەوە.
سیسیلیا کاسێتی گۆرانیەکانی 'سیسیل کیارکەبیوی' خستە ناو هێدفۆنەکەیەوە، هەندێ گۆرانی تایبەت بە جەژنی لەدایکبوونی مەسیحی تێدابوو. پاش نەختێک گوێچکەکانی هەموو جەوی خۆشی ناو کاسێتەکەی بۆخۆی ڕاکێشا. دواتر هێدفۆنەکەی لەگوێی کردەوە و.. بەڵێ، گوێی لێبوو ئەوانی تر دانیشتبوون.
دایکی هەندێ بەسەرهاتی ناو ئینجیلی دەخوێندەوە. کە تەواوبوو گۆرانی 'زەوی جوان'یان وت.
پاشان نەنکی بە پلیکانەکاندا سەرکەوت. سیسیلیا خۆی هەموو شتێکی ڕێک خستبوو.
_ وا هاتم سیسیلیا!
_ ششش! دەستبکە بە خوێندنەوەی...
نەنکی لەسەر کورسیە بە شوڵ چنراوەکەی تەنیشت جێگای خەوەکەیەوە دانیشت و دەستیکرد بە خوێندنەوە؛

_ "لەو ڕۆژانەدابوو کە 'ئاوگۆستوس'ی قەیسەر فەرمانیدا سەرژمێری دانیشتوانی وڵاتەکەی بکەن.."
لەو کاتەدا کە سەری لەسەر ئینجیلەکە هەڵبڕی، فرمێسک ناو چاوی سیسیلیای تەڕکردبوو.
_ ئەوە دەگریت؟
سەرێکی بۆ لەقاند.
_ بەڵام خۆ شتێکی ناخۆش نیە کە..
سیسیلیا دیسانەوە سەری بۆ لەقاندەوە؛
_ "ئەمەش ئەو نیشانەیەیە کە دێتە بەردەمتان؛ دەبێ ئەو منداڵە بدۆزنەوە کە قوماتکراوە و لە لانکێکدایە".
_ مەبەستت لەوەیە کە ئەو قسەیە جوانە.
سیسیلیا بۆ جاری سێهەم سەری بۆ لەقاندەوە.
کەمێک دواتر نەنکی وتی؛
_ لەکاتی دڵتەنگیدا دەگرین، بەڵام هەندێجار کە شتێکی جوانیش دەبینین فرمێسکێکی بۆ هەڵدەڕێژین.
_ بەڵام خۆ بە شتێکی ناشیرین پێناکەنین؟
نەنکی ناچاربوو بەر لەوەڵامدانەوەی کەمێک بیربکاتەوە.
_ ئێمە بە قەشمەرچیەکانی سێرک پێدەکەنین، چونکە هەزەلین. جارجارێکیش لەبەرئەوە پێیان پێدەکەنین چونکە ناشیرینن... دە تۆ سەیرێکم بکە!
نەنکی بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین دەموچاوی بۆ بادا و سیسیلیاش خۆی پێنەگیرا و پێی پێکەنی.
نەنکی لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛
_ ڕەنگە بینینی شتێکی جوان بۆیە دڵتەنگمان بکات، چونکە دەزانین بۆ هەمیشە نامێنێتەوە. بەهەمان شێوەش بە شتێکی ناشیرین پێدەکەنین، چونکە لەوە تێدەگەین کە خۆی دەنوێنێت.
سیسیلیا چاوی تێبڕیبوو. بەلایەوە نەنکی زیرەکترین کەسی سەر دونیابوو. ئەوجا وتی؛
_ دەبڕۆرە خوارەوە بۆ لای قەشمەرچیەکانی تر.

نەنکی سەرینەکەی ڕاستکردەوە و دەستێکی هێنا بە ڕومەتیدا.
ـ چاوەڕوانی ئەو کاتەم کە تۆش دێیتە خوارەوە. ئێستا خەریکی نان خواردن دەبین..
هەرئەوەندەی نەنکی بە پلیکانەکانەکاندا چووە خوارەوە، سیسیلیا کەوتە دەستەکوتێ و بەدوای قەڵەم و دەفتەری یاداشتە چینیەکەیدا گەڕا. یەکەمین شت نوسی؛

"من چیتر لەسەر ڕۆخێکی نەناسراوی سەر دەریای ئەدریاتیک نەوەستاوم. بەڵام شەپۆلەکان بەردەوام بەرەوڕوی قەراغی دەریاکە ملدەنێن، بەو هۆیەشەوە بەردە وردەکان بۆ هەتاهەتایە دێن و دەچن و جێگۆڕکێ دەکەن"

بەپەلە ئەو دێڕانەی خوێندەوە کە نوسیبوونی و دواتر بەردەوامبوو لەسەر نوسین؛

"لەکاتی دڵتەنگیدا دەگرین، بەڵام هەندێجار کە شتێکی جوانیش دەبینین فرمێسکێکی بۆ هەڵدەڕێژین. کە شتێکی هەزەلی یان ناشیرین دەبینین پێدەکەنین. ڕەنگە بینینی شتێکی جوان بۆیە دڵتەنگمان بکات، چونکە دەزانین بۆ هەمیشە نامێنێتەوە. بەهەمان شێوەش بەشتێکی ناشیرین پێدەکەنین، چونکە لەوە تێدەگەین کە خۆی دەنوێنێت.
خۆشە تەماشای قەشمەرچیەکانی سێرک بکەین، چونکە هەر زۆر ناشیرینن. ئەو کاتە زۆر جوان دەبن کە لەبەردەم ئاوێنەی ئارایشتەکەیاندا دەمامکی قەشمەرچێتیان دادەکەنن. هەربۆیە قەشمەرچیەکان هەموو کەڕەتێک دڵتەنگ و نائاسودە دەبن کە دەچنە ناو ماشێنی سێرکەکەوە و هەر لەبەرئەوەشە کە دەرگاکە بەتوندی بەدوای خۆیاندا دادەخەن"

خەوی لێکەوت و ئەو کاتە خەبەری بووەوە کە باوکی هاتە سەرەوە بۆلای بۆ ئەوەی بیباتە خوارەوە. باوکی وتی؛
ـ کاتی دیاری بەخشینەوەیە!

هەردوو دەستی خستە ژێر سیسیلیاوە و بەخۆی و لێفە سورەکەیەوە بەرزیکردەوە. سەرینەکەی هەڵنەگرت، بەو شێوەیەش لەو کاتەدا کە بەرزیکردەوە قژە کاڵەکەی بەرەو زەوی شۆڕبووەوە. قژی دیسانەوە بەتەواوەتی درێژبووبووەوە.

لە خواری خوارەوەی پلیکانەکاندا 'لاس' و باپیرەی وەستابوون.

باپیرەی وتی؛

_ هەر لە فریشتە دەچی، لێفەکەت لە هەورێکی گوڵاوی دەچێ.

'لاس'یش کەوتە وتنی گۆرانی "فریشتەکان بە نهێنی دێنە خوارەوە".

لەناوەڕاستی پلیکانەکاندابوو کە سەری وەرچەرخاند و تەماشای ناو چاوی کردن.

سیسیلیا بەرپەرچی قسەکەی 'لاس'ی دایەوە و وتی؛

_ قسەی قۆڕ و بێمانا! فریشتەکان *لەسەر* هەورەکان دانیشتوون. خۆ نایەن لەژێریاندا لارولەنجە بکەن.

باپیرەی مرخەمرخێکی بۆ کرد و وەک وەڵامێک فوویەکی پڕ لە دوکەڵی چڕی سیگارەکەی بەژورەکەدا بڵاوکردەوە.

باوکی لەسەر قەنەفە سورە بێپشتەکە سیسیلیای پاڵخست. سەرینێکی زۆریان لەسەر هەڵچنیبوو تا بتوانێت دار سنەوبەرەکە ببینێت.

سەیرێکی سەرەوەی کرد و وتی؛

_ ئەو ئەستێرەیە ئەوەی ساڵی پێشوو نیە.

دایکی بەهەڵەداوان خۆی گەیاندێ –دەتوت پێی ناخۆشە کە هەموو شتێک وەک ساڵی پێشوو نیە؛

_ نەخێر ئەو نیە، ئەستێرەکەی پارمان بۆ نەدۆزرایەوە، لەبەرئەوە باوکت ناچاربوو دانەیەکی نوێ بکڕێت.

_ سەیرە...

سیسیلیا تەماشایەکی ئەملاولای ژورەکەی کرد و ئەوانی تریش سەیری سیسیلیایان دەکرد کە بەچواردەوری خۆیدا دەیڕوانی. هەم سەیری سیسیلیایان دەکرد و هەم تەماشای ئەو شتانەشیان دەکرد کە ئەو نیگای دەچووە سەری.

ژورەکە تاریک نەبوو، سیسیلیا 27 مۆمی ژمارد –ڕێک هێندەی ژمارەی ئەلقەکانی پەردەکەی سەرەوە کە لە داپیرە هەرە گەورەکەیەوە بۆیان مابووەوە. چ ڕێکەوتێکی سەیربوو!
هەموو دیاریەکانیان لە ژێر دار سنەوبەرەکەدا دانابوو. تەنها یەک شت جیاوازبوو لە جەژنی ساڵی پار، ئەویش ئەوەبوو کە باپیرە خۆی نەکردبوو بە 'بابە نوئێل'. ئەوەشیان هەر لەسەر خواستی سیسیلیابوو.
_ وابزانم تاقەتی شتێکی قۆڕی وەک بابە نوئێلم نیە.
سەر مێزەکە پڕبوو لە قاپ و کوپی قاوە، سینیەک کێک و حەڵوای بە بادەم و شەکر دروستکراوی لەسەر دانرابوو کە بە ڕەنگی میوە ڕازاندبوویانەوە.
_ حەزت لە هیچ نیە؟
_ کەمێک شەربەتی لیمۆ و پارچەیەک کێک بەبێ کرێمی توی فەرەنگی.
هەموویان بەچواردەوەیدا وەستابوون. 'لاس' لە دواوە وەستابوو. لەوەدەچوو کەمێک پێی ناخۆشبێت کە سیسیلیا بۆ ئەوە هاتبووە خوارەوە کە بەشداری دابەشکردنی دیاریەکان بێت. بەلایەنی کەمەوە زۆر بەشێوەیەکی نائاسایی دەهاتە بەرچاوی.
_ جەژنت پیرۆزبێت 'لاس'.
_ جەژنی خۆشت پیرۆزبێت.
باپیرەی وتی؛
_ ئینجا کاتی دیاریەکانە. ئەو کارە گەورەیەیان بە من بەخشیوە.
هەموویان بەچواردەوری دارەکەدا دانیشتن و باپیرە کەوتە خوێندنەوەی کارتی سەر دیاریەکان. سیسیلیا سەرنجی لەدیاریە پێچراوەکاندا و پێی وانەبوو هیچ یەکێکیان تاخورک یان پێڵاوی خلیسکێنەی سەر بەفری تێدا بێت، بەڵام دانی بەخۆیدا گرت و تورە نەبوو. چونکە پێی دەچوو دیاری تریان لەملاولای ماڵەکەدا شاردبێتەوە، لەوەوپێش شتی وا ڕوویدابوو.
_ لە 'ماریانا'وە بۆ سیسیلیا.

'ماریانا' ئازیزترین کچە برادەری سیسیلیابوو، ماڵیان لەوبەری 'لیرا'بوو، بەڵام لەهەمان پۆلدا پێکەوە قوتابیبوون.
پاکەتێکی زۆر بچکۆلەبوو، بڵێیت زێڕوزیوی تێدا بێت؟ یان ڕەمبێکم شتێکی نوێ بێت و لەگەڵ زێڕوزیوەکانی تریدا بەکاربهێنرێت..
کاغەزەکەی لێکردەوە و قوتیلەیەکی زەردی کردەوە. پەپولەیەکی سوری لەسەر پارچە لۆکەیەکی بچکۆلە بینی، بەدەرزیەکەوە کە بە جلەوە دەکرێت.. سیسیلیا پەپولەکەی لە ناو قوتیلەکەدا دەرهێنا و هەرکە دەستی بەرکەوت یەکسەر ڕەنگەکەی گۆڕا بۆ سەوز. پاشان ڕەنگەکەی بووبە شین و وەنەوشەیی.
_ پەپولەیەکی ئەفسوناویە...
باوکی سەرێکی لەقاند و وتی؛
_ لەگەڵ گۆڕانی پلەی گەرمادا ڕەنگەکەی دەگۆڕێت.
هەموویان دەیانویست ئەو پەپولەیە بەدەستەوە بگرن. کاتێک کە دەیانخستە لەپی دەستیانەوە، ڕەنگەکەی دەگۆڕا بۆ سەوز و شین. تەنها لەدەستی سیسیلیادا دەبووە وەنەوشەیی.
لاس وتی؛
_ پەپولەی 'تا'یە.
بەڵام هەموویان وا خۆیان نیشاندا کە گوێیان لە قسەکەی نەبوو.
دووهەمین دیاری بۆ لاس بوو. ئامۆژنە 'ئینگرید' و مامە 'ئاینە' جوتێ پێڵاوی منداڵانەی خلیسکێنەی سەر بەفریان بەدیاری بۆ هێنابوو.
سیسیلیا وتی؛
_ من بومایە ئەموت خۆزگە پێڵاوی ڕاستەقینەی خلیسکێنە بوایە، بەڵام من نامەوێت خۆم لە دیاریەکانی تۆ هەڵقورتێنم.
دواتر دیاریەکان یەک بەدوای یەکدا دابەشکران. هێدی هێدی پاکەتەکانی ژێر دار سنەوبەرەکە کەم دەبووەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەرەبەرە سەر مێز و کورسیەکان پڕدەبوو لە شتی جۆراوجۆر. باوکی هەموو کاغەزەکانی کۆدەکردەوە و دەیخنینە ناو کیسەیەکی ڕەشی گەورەوە.

کەمێک دواتر باپیرەی چووە دەرەوە. گەورەکان قاوەیان دەخواردەوە، لاس'یش ساردی. دەرمانیشیان دا بە سیسیلیا.
کە باپیرەی گەڕایەوە ژوورەوە شتێکی درێژ و قورسی پێبوو، لە کاغەزێکی شینی دیاریەوە پێچرابووەوە و ئەستێرەی ئاڵتونی پێوەبوو.
سیسیلیا خۆی لەسەر قەنەفەکە بەرزکردەوە؛
ـ پێڵاوی خلیسکێنەی سەر بەفر!
باپیرەی کارتەکەی سەری خوێندەوە و وتی؛
ـ بۆ خلیسکێنە بازەکە.
ـ خلیسکێنەباز؟
نەنکی وتی؛
ـ یان بۆ خواژنی خلیسکێنە. بۆ تۆیە سیسیلیا.
سیسیلیا بەپەلە کاغەزەکەی داماڵی. پێڵاوەکان هەروەک ڕەنگی کاغەزەکەی دەدرەوشانەوە، بەڵام ڕەنگیان سوربوو.
ـ هەر زۆرم پێخۆشە! خۆزگە بمتوانیبایە ئائێستا یەکسەر تاقیمبکردایەتەوە.
ـ وایە، هیواداریین بەم زوانە بێیتەوە سەرپێ.
ئیدی لەوەبەدواوە سیسیلیا پێڵاوەکانی لەسەر قەنەفەکە دانا و ئەوانی تر خەریکی دیاریەکانی تر بوون. دواهەمین دیاریش هێندە گەورەبوو کە دەبوایە لەدەرەوەوە بیهێنن، ئەو یەکەشیان هەر بۆ سیسیلیابوو. هەر لەدورەوە زانی دیاریەکەی چیە.
ـ شێتبوون.. تاخورک!
دایکی خۆی بەسەردا چەماندەوە و دەستێکی هێنا بە ڕومەتیدا.
ـ بۆ پێتوایە ئەمانوێرا شتێکی ترت بەدیاری بۆ بکڕین؟
سیسیلیا شانێکی بۆ هەڵتەکاند.
ـ بەڵام وێراتان پێڵاوی خلیسکێنەی سەر سەهۆڵم بۆ نەکرن.
ـ بەڵێ، وەک قومارێک وێرامان ئەوەیان بکەن.
پاشان مێزەکەیان بۆ کاتی قاوە و کێک ڕازاندەوە. سیسیلیا پێی خۆشبوو کە سەیری ئەو هەموو کێک و میوە و گوێز و چەرەسەی سەر مێزەکەی دەکرد. ڕێک دەبوایە هەر وا بوایە، دەبوایە جەژنی لەدایک

بوونی مەسیح بوایە. ئەو خۆی تەنها پارچەیەک کێکی خوارد و دواتریش داوای پارچەیەک سەمونی برژاو و هەنگوینی کرد.
باپیرەی باسی جەژنی زەمانی زووی بۆ دەگێڕانەوە. ماوەی شەست ساڵی ڕەبەق بوو لەو ژورەدا جەژنی کردبوو. ساڵێکیان ئەویش نەخۆشکەوتبوو و لەجێگادا کەوتبوو.
لەو کاتەدا کە خەریکبوو بەدەوری دار سنەوبەرەکەدا سەمابکەن، سیسیلیا کەوتە چاوتروکاندن. داوایکرد هەڵیبگرن و ببیبەنەوە بۆ ژورەکەی خۆی.
لەپێشدا لاس و دایکی بەپەلە هەموو دیاریەکانی سیسیلیایان بردە سەرەوە، چونکە دەیویست هەمووی لەژورەکەیدا بێت. دواتریش دوای ئەوەی جەژنە پیرۆزەیان لەیەکتریکرد، باوکی بەباوەش هەڵیگرت و بردیە سەرەوە.
بەو شێوەیە سیسیلیا خەوی لێکەوت، لەگەڵ دەنگی گۆرانی ئەو جەژنە و سەمای چواردەوری دار سنەوبەرەکەدا خەوت کە لە قولایی قاتی خوارەوە وەک بلقەبلقێک دەگەیشتە لای. نەنکی پیانۆی لێدەدا.



لە پڕێکدا خەبەری بووەوە. لەوەدەچوو شەوبێت، چونکە ماڵەکە بەتەواوەتی کپ و خامۆشبوو. سیسیلیا چاوی کردەوە و گڵۆپی سەر جێگاکەی داگیرساند.
گوێی لەدەنگێک بوو کە لێیپرسی؛
_ باش خەوتیت؟
نەیزانی کێ بوو.. نە کەس لەسەر کورسی بەردەم جێگاکەدا دانیشتبوو و نە کەسیشی بینی بەپێوە لەسەر عەرزەکە وەستابێت.
دیسانەوە دەنگەکە وتیەوە؛
_ باش خەوتیت؟
سیسیلیا بەچواردەوریدا ڕوانی، سەری بەرزکردەوە و ئینجا زانی دەنگەکە لە کوێوە دێت. تارماییەک لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانیشتبوو. لەوێدا تەنها جێگای منداڵێک دەبووەوە و تارماییەکە 'لاس'یش نەبوو. ئەی دەبێت کێ بێت؟
کەسە نامۆکە بەدەنگێکی ڕون و ئاشکراوە وتی؛
_ مەترسە.
دیارنەبوو کچە یان کوڕ، بەڵام کراسێکی سپی درێژی لەبەردابوو و پێشی پەتیبوو. سیسیلیا کەمێکی سیمای دەبینی، چونکە تیشکی تیژی گڵۆپی دارەکەی دەرەوە بەرەوڕوییبوو.
باوەڕی بەچاوی خۆی نەدەکرد، لەبەرئەوە چاوی هەڵگڵۆفیێ، بەڵام تارماییە سپی پۆشەکە هەر لەشوێنی خۆیدا دانیشتبوو.
کچبوو یان کوڕ؟ سیسیلیا لەوە دڵنیا نەبوو، چونکە کەسەکە یەک تاڵ قژ چیە بەسەریەوە نەبوو. لەدڵی خۆیدا وتی کوڕە، بەڵام زۆر ڕێشی تێدەچوو کە پێچەوانەکەی بێت.
دیسانەوە میوانە پڕنهێنیەکە وتیەوە؛

_ باشە ناتوانیت هەر هێندەم پێبڵێیت کە باش خەوتیت یان نا؟
_ بەڵێ دەتوانم.. بەڵام تۆ کێیت؟
_ 'ئاریل'.
دیسانەوە سیسیلیا ناچاربوو چاوی هەڵبگلۆفێتەوە.
_ ئاریل؟
_ بەڵێ، من ناوم 'ئاریل'ە سیسیلیا.
سیسیلیا سەرێکی بۆ ڕاوەشاند؛
_ هێشتا نازانم تۆ کێیت.
_ بەڵام ئێمە تارادەیەک هەموو شتێک دەربارەی ئێوە دەزانین. هەر کتومت وەک ئاوێنەیەک وایە.
_ وەک ئاوێنەیەک؟
کوڕەکە خۆی چەماندەوە، لەوەدەچوو پاش نەختێک بکەوێت بەسەر مێزی نوسینەکەدا؛
_ ئێوە تەنها خۆتان دەبینن و بەس، بەڵام شتەکانی لاکەی ئەو بەر نابینن.
سیسیلیا داچڵەکی. ئەو کاتەی کە منداڵتربوو، زۆرکەڕەت لە حەمامەکەیاندا لەبەردەم ئاوێنەکەدا دادەنیشت و مەزەنەی جیهانێکی تری دەکرد کە لەو دیوی ئاوێنەکەوە هەبێت. تاوناتاوێک لەو کاتانەدا کە خۆی ڕێکدەخست لەوە دەترسا کە کەسێک لەودیوەوە هەبێت و لەشوشەکەوە ئەم ببینێت و بەدزیەوە سەیریبکات. لەوەش خراپتر؛ هەندێجار بیری بۆ ئەوە دەچوو کە ئەو کەسە لەناکاودا لە ئاوێنەکەوە بێتە دەرەوە و خۆی فڕێبداتە ناو حەمامەکەیانەوە.
ئەوجا لێی پرسی؛
_ باشە تۆ قەت لەوەوپێش هاتوویتەتە ئێرە؟
زۆر بەجدی سەری بۆ لەقاند.
_ ئەی چۆن دەهاتیتە ژورەوە؟
_ سیسیلیا، ئێمە دەچینە هەموو شوێنێک.
باوکم دەرگاکە دادەخات. لە زستانانیشدا هەموو پەنجەرەکان دادەخەین..

قسەکەی پێبڕی و وتی؛
_ ئەو شتانە نابنە ڕێگر بۆ ئێمە.
_ کام شتانە؟
_ مەبەستم لە دەرگای داخراو و شتی وایە.
سیسیلیا زۆر باش بیری کردەوە. ڕێک لەوە دەچوو کە فیلێک لە فیلەکانی فیلمێکی ببینێ. فیلمەکەی گەڕاندەوە بۆ دواوە و دیسانەوە تەماشای هەمووی کردەوە.
_ تۆ هەر دەڵێیت 'ئێمە'، بۆ ئێوە هێندە زۆرن؟
سەرێکی بۆ لەقاند.
_ بەڵێ، هەر زۆر زۆرین. وا هاتین!
بەڵام سیسیلیا تاقەتی ئەو هەموو مەتەڵ و نهێنیکاریانەی نەبوو. وتی؛
_ پێنج ملیارد کەس لە سەر ئەم زەویە دەژی. جگە لەوەش لەشوێنێکدا هێندەم خوێندەوە کە تەمەنی ئەم زەویە پێنج ملیارد ساڵە. تۆ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە؟
_ بێگومان. ئێوە دێن و دەڕۆن.
_ چیت وت؟
_ زۆر بە ئاسانی هەموو چرکەیەک کۆمەڵێک ساوای تازە بەهۆی خوداوە پێدەنێنە ناو بوونەوە. هەر لە جادوو دەچێت! هەموو چرکەیەکیش هەندێ خەڵک ون دەبن. سیسیلیا، بە ڕیزی درێژ درێژ لە ڕیزەکەدا دێنە دەرەوە..
سیسیلیا هەستیکرد کوڵمەکانی گەرمداهاتوون. وتی؛
_ تۆ خۆت دێیت و دەڕۆیت.
زۆر بەدڵنیاییەوە سەرە بچکۆلە کەچەڵەکەی بۆ ڕاوەشاند؛
_ تۆ دەزانیت ئەم ژورە کاتی خۆی ژوری نوستنی باپیرەت بووە؟
_ بێگومان ئەوە دەزانم، بەڵام تۆ لەکویوە ئەوە دەزانیت؟
ئاریل کەوتبووە قاچە فرتێ. بەلای سیسیلیاوە هەر لە بوکەشوشە دەچوو.
کوڕەکە لەویادا وتی؛

_ کەواتە دەستمان پێکرد.
_ زەحمەت نەبێت.. دەستمان بە چی کرد؟
_ تۆ هێشتا پێت نەگوتم باش خەوتیت یان نا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەستمان پێکرد. هەمیشە لەسەرەتادا کەمێک کاتی دەوێت تا بەتەواوەتی دەچینە ناو بابەتێکەوە.
سیسیلیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەبێزارییەکەوە فرێیدایەوە دەرەوە؛
_ تۆ وەڵامت نەدامەوە.. تۆ لە کوێوە دەزانیت ئەم ژورە کاتی خۆی هی باپیرەم بووە؟
ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "تۆ لە کوێوە دەزانیت ئەم ژورە کاتی خۆی هی باپیرەم بووە؟"
_ بەڕاست لە کوێوە ئەوە دەزانیت؟
ئەو هەر خەریکی لەقە فرتێی خۆی بوو؛
_ سیسیلیا، ئێمە هەر لەسەرەتای کاتەوە لێرەدابووین. ئەو کاتەی باپیرەت منداڵبوو، جەژنێکی تەواو بەسەختی توشی نەخۆشی هەوکردنی سیەکانی بوو و لەجێگادا کەوت، ئەو کاتە هێشتا هیچ دەرمانێکی وا نەدۆزرابووەوە کە سودێکی باشی هەبێت.
_ ئەو کاتەش تۆ لێرەبوویت؟
سەرێکی بۆ لەقاند.
_ هەرگیز چاوە ماتەکانی باپیرەتم بیرناچێتەوە. هەر لە دوو زەڕنەقوتەی بەجێماو دەچوون.
سیسیلیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی؛
_ "دوو زەڕنەقوتەی بەجێماو".
سیسیلیا تەماشایەکی کرد و بەپەلە وتی؛
_ بەڵام ڕزگاریبوو. دواتر بەتەواوەتی چاک بووەوە.
_ بەڵێ.. بەتەواوەتی چاکبووەوە.
زۆر بەخێرایی فرتەیکرد و لەماوەی چاوتروکاندنێکدا لەسەر قەراغی پەنجەرەکە بەپێوە وەستا. کەم تا زۆر بەژنی هێندەی درێژی

پەنجەرەکە دەبوو. سیسیلیا بەهۆی ڕوناکیە تیژەکەی بەرامبەریەوە هێشتا نەیدەتوانی بەڕونی دەموچاوی ببینێت.
بەبێ ئەوەی بێتە خوارەوە بۆ سەر مێزی نوسینەکە چۆن توانی ئاوها هەستێتە سەرپێ؟ لەوەدەچوو کە ئەو توانایەکی سەیری هەبێت و نەکەوێتە خوارەوە.
پاشان وتی؛
_ شوانەکانی ناو کێڵگەکەشم لەیادە.
سیسیلیا ئەو دێڕانەی بەخەیاڵدا هات کە نەنکی لە ئینجیلەوە بۆی خوێندبووەوە، و وتی؛
_ "ڕێز و شکۆ بۆ خودای ئاسمان و سەر زەوی! با بەڕەزامەندی خودا ئاشتی بۆ مرۆڤ بێت!".. مەبەستت لەوەیە؟
_ بەڵی، "دەسەڵاتداری ئاسمان". لەوێدا بەکۆرسێکی تەواو ئەوەمان دەوتەوە.
_ بەهیچ جۆرێک بڕوات پێناکەم.
'ئاریل'سەری لارکردەوە و لەوکاتەدا سیسیلیا کەمێک باشتر دەموچاوی بینی. هەر لە دەموچاوی یەکێک لە بوکەکانی 'ماریانا' دەچوو.
ئاریل وتی؛
_ چەندە گوناحیت.
_ چونکە نەخۆشم؟
سەری بۆ ڕاوەشاند.
_ مەبەستم لەوەیە.. ڕەنگە ناخۆشبێت کە قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەیت و باوەڕی پێنەکەیت.
_ ئەوها!
_ ئەرێ ئەوە ڕاست نیە کە دەڵێن ئێوە هەندێ جار هێندە گوماندەکەن کە ناوەوەتان بەتەواوەتی ڕەش هەڵدەگەڕێت؟
سیسیلیا دەموچاوی ترشاند بەسەر یەکدا.
ئاریل هەروا بۆ دڵنیایی وتی؛

_ من هەروا پرسیارێکم کرد و هیچی تر. ڕاستە هێندەمان بینیوە کە مرۆڤ بە چ شێوەیەک دێن و دەچن، بەڵام بەڕاستی نازانین چ جۆرە هەستێکت دەبێت ئەگەر لە لەش و خوێن پێکهاتبیت.
سیسیلیا لەسەر جێگاکەیدا ڕوی لێوەرچەرخاند، بەڵام ئاریل وازی نەهێنا.
_ تۆزێک ناخۆش نیە کە هێندە بە گومان بیت؟
_ لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کە ڕاستەوڕاست درۆیەک بدەیت بەڕوی کچێکی نەخۆشدا.
ئاریل دەستی بردە لای دەمیەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا؛
_ سیسیلیا فریشتەکان درۆ ناکەن!
ئەوجا ئەو کەوتە هەناسە هەڵکێشان؛
_ بۆ تۆ بەڕاستی فریشتەیت؟
بۆماوەیەکی کەم سەری بۆ لەقاند -وەک ئەوەی فریشتەیی شتێک نەبێت کە شانازی پێوەبکرێت. یەکسەر سیسیلیا کەمێک هێمن و وریا بووەوە. پاش چەند چرکەیەک ئەوجا وتی؛
_ من هەر لەسەرەتاوە لەو بڕوایەدابووم. وایە، بەتەواوەتی ڕاستە. بەڵام نەموێرا پرسیاربکەم، چونکە نەمدەزانی ڕاستم یان هەڵە. لەڕاستیدا خۆشم دڵنیا نیم لەوەی کە باوەڕم بە فریشتە هەیە یان نا.
دەستێکی بۆ ڕاوەشاند و بەفیزێکەوە قسەکەی ڕەتکردەوە؛
_ بەبڕوای من باشترێکە واز لەو یاریە بهێنین. باشە چی دەبوو ئەگەر من بمواتەیە "دڵنیانیم لەوەی بڕوام بە تۆ هەبێت"، ئەو کاتە مەحاڵبوو بیسەلمێنین کاممان ڕاست دەکەین.
هەر وەک بیەوێت نیشانیبدات کە فریشتەیەکی چالاک و ساغە، خۆی هەڵدایە سەر مێزی نوسینەکەی بەردەم پەنجەرەکە و لەمسەرەوە بۆ ئەوسەری مێزەکە دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. یەک دووجارێک واهاتە بەرچاو کە هاوسەنگی خۆی لەدەستبدات و بکەوێتە خوارەوە، بەڵام هەموو کەرەتێک ڕێک پێشئەوەی بکەوێتە سەر زەویەکە خۆی ڕاستدەکردەوە. کەرەتێکیشیان وا هاتە بەرچاوی کە چرکەیەک دوای ئەوەی بەتەواوتی هاوسەنگی خۆی لەدەستدا، خۆی بگرێتەوە.

سیسیلیا لەبەردەم خۆیەوە وتی؛
_ "فریشتەیەک لەماڵەکەمدایە".
قسەکەی بەشێوەک کرد هەر دەتوت ناونیشانی کتێبێک دەخوێنێتەوە.
'ئاریل'یش وەڵامی دایەوە و وتی؛
_ ئێمە خۆمان ناوی خۆمان ناوە 'منداڵی خوا'.
سیسیلیا بەلاچاوێک تەماشایکرد و وتی؛
_ بەلایەنی کەمەوە تۆ..
_ من چی؟
سیسیلیا هەوڵیدا کەمێک لەسەر جێگاکەی خۆی بەرزبکاتەوە، بەڵام بەتوندی کەوتەوە بەسەر سەرینەکەیدا. دواتر وتی؛
_ تۆ فریشتەیەکی منداڵیت.
تائەندازەیەک بەشێوەیەکی بێدەنگ پێی پێکەنی.
سیسیلیا پرسیارێکی لێکرد و وتی؛
_ چیە.. بە چی پێدەکەنیت؟
_ "فریشتەی منداڵ". تۆ خۆت پێت وانیە کە ئەوە وشەیەکی هەر زۆر هەزەلی بێت؟
سیسیلیا پێی وانەبوو ئەو وشەیە وشەیەکی هەزەلی بێت، بۆیە لێی تێنەگەیشت و وتی؛
_ ئێ خۆ تۆ فریشتەیەکی گەورە نیت. کەواتە دەبێت فریشتەیەکی منداڵ بیت.
ئاریل دیسانەوە پێکەنیەوە، ئەو جارەیان بەدەنگێکی کەمێک بەرزتر. ئەوجا وتی؛
_ ئەوەیان هەر زۆر دەگمەن ڕوودەدات. لەڕاستیدا ئێمە قەت گەورە نابین، بەو شێوەیەش هەرگیز نابینە کەسێکی 'گەورە'.
سیسیلیا لەناکاودا وتی؛
_ سەرم گێژدەخوات!
_ بەداخەوە، چونکە پێموایە هەر زۆر باش چووبووینە ناو بابەتەکەوە.
سیسیلیا سوربوو لەسەر قسەکەی خۆی و وتی؛

_ بەڵام من وامدەزانی هەموو فریشتەکان گەورەن.
ئاریل شانەکانی هەڵتەکاند؛
_ ئەوە خەتای تۆ نیە. ئێ تۆ بەچیدا بزانیت لە لاکەی تردا چی هەیە؟
_ مەبەستت لەوەیە کە فریشتەی گەورە بوونی نیە؟
پڕبەدڵ قاقایەکی لێدا. سیسیلیا یەکسەر دەنگی هەڵماتە مەرمەڕیەکانی 'لاس'ی بیرکەوتەوە کە ڕۆژێکیان لە چێشتخانەکەیاندا هەڵیڕشت. ئەو جارە دواتر هەر هەموو هەڵماتەکانیان بە 'لاس' کۆکردەوە.
سیسیلیا وەک ئەوەی بیەوێت دڵنیابێت، وتیەوە؛
_ کەواتە تەنانەت یەک فریشتەی گەورەش بوونی نیە.
_ پێدەچێت هەبێت، بەڵام ئەو کاتە هیچ قەشەیەکی ڕاستگۆش بوونی نابێت، چونکە ئەوان هەموویان بەردەوام دەڵێن ئاسمان جمەی دێ لە فریشتەی گەورە.
بۆ ساتێک بەتەواوەتی بێدەنگ بوون و دواتر 'ئاریل'ی فریشتە بەشێوەیەکی زۆر جوان دەستێکی بادا و لەپڕێکدا وتی؛
_ "ئاسمان جمەی دێ لە فریشتەی گەورە".. "جمەی دێ!"
سیسیلیا وەڵامی نەدایەوە، لەبەرئەوە یەکسەر وتی؛
_ قسەکردن لەگەڵ تۆدا زۆر خۆشە سیسیلیا.
سیسیلیا گازی لە پەنجە گەورەی دەگرت و لەناکاوێکدا وتی؛
_ خۆزگە دەمزانی گەورەیی چۆنە.
ئاریل لەسەر قەراغی مێزەکە دانیشت و پێ پەتیەکانی دیسانەوە دەرکەوتنەوە؛
_ دەتەوێت باسی ئەوە بکەین؟
سیسیلیا هەروا پاڵکەوتبوو و تەماشای سەقفەکەی دەکرد؛
_ مامۆستاکەم دەڵێت سەردەمی منداڵی قۆناغێکی بەر لە گەورەبوونە و هیچی تر. لەبەرئەوە دەبێت هەموو ئەرکەکانی ماڵەوەمان ئەنجامبدەین و خۆمان بۆ ژیانی گەورەیی ئامادەبکەین. تۆ ئەوەت بەلاوە سەخت نیە؟

ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند.
_ لەڕاستیدا ڕێک پێچەوانەکەیەتی.
_ چۆن؟
_ تافی گەورەیی قۆناغێکە بۆ ئەوەی منداڵی زیاتر لەدایک ببێت.
سیسیلیا باش بیری کردەوە و ئینجا وەڵامی دایەوە؛
_ بەڵام لە پێشدا گەورەکان خوڵقێنراون. ئەگەر وا نەبوایە ئەوا هیچ منداڵێک لەدایک نەدەبوو.
ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛
_ دیسانەوە ئەوەش هەڵەیە. لەپێشدا منداڵ خوڵقێنراوە، ئەگەر نا ئەوا هیچ کەسێکی گەورە نەدەبوو.
سیسیلیا خەیاڵێکی باشی بە مێشکدا هات؛
_ ئەوەش هەروەک هەمان ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت مریشک لە پێشدا هەبووە یان هێلکە.
ئاریل دیسانەوە کەوتە جوڵانەوەی قاچەکانی؛
_ ئەرێ ئەوە بەڕاستی هێشتا هەر خەریکی ئەو جۆرە مەتەڵانەن؟ من یەکەمین جار ئەو مەتەڵم لە پیاوێکی پیری هیندی بیست کە مریشکی بەخێودەکرد، بەڵام ئەوە پێش چەند هەزار ساڵێک لەمەوبەربوو. یەکێک لە مریشکەکانی هێلکەیەکی گەورەی کردبوو، ئەویش خۆی بەسەردا چەماندەوە.. دواتر سەرێکی بۆ خوراند و وتی "خۆزگە دەمزانی کامیان لە پێشدا هەبوون، هێلکە یان مریشک"
سیسیلیا بەشەرمەوە تەماشایەکی 'ئاریل'ی کرد و فریشتەکەش کەوتە ڕونکردنەوە؛
_ بێگومان دەبێت هێلکەکە لە پێشدا هاتبێت.
_ بۆ؟
_ ئەگەر نا، ئەوا هیچ مریشکێک دروست نەدەبوو. خۆ تۆ پێت وانیە یەکەمین مریشک هەروا لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوە؟
سیسیلیا سەری لێتێکچوو. بەتەواوەتی نەیدەزانی لە هەموو قسەکانی فریشتەکە دەگات یان نا؛ بەڵام ئەو هێندە کەمەی کە تێگەیشتبوو، زۆر بەڕاست دەهاتە بەرچاوی. لەدڵی خۆیدا وتی "وا دواجار وەڵامی

ئەو مەتەڵە کۆنەم بۆ دەرکەوت. خۆزگە تا بەیانی بمتوانیبایە لەبیرم بێت..."
ئینجا ئاریل لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و وتی؛
_ بۆ منداڵەکانیش بەهەمان شێوەیە. ئەوان لە پێشدا دێنە دونیاوە. گەورەکان هەمیشە دواتر دێن. هەتاوەکو بەتەمەنتریش بن، درەنگتر و درەنگتر دێن.
سیسیلیا قسەکانی 'ئاریل'ی بەلاوە زیرەکانەبوو، هێندەی پێ جوانبوو کە دەیویست لە دەفتەرە چینیەکەیدا بیاننوسێتەوە تا لەیادیان نەکات. بەڵام نەیوێرا لەو کاتەدا بیان نوسێتەوە کە فریشتەکە لەوێ بوو. دواتر وتی؛
_ بەڵام ئادەم و حەوا گەورەبوون.
ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛
_ *دواتر* گەورە بوون. هەڵە گەورەکەش ئا لێرەوە سەریهەڵدا. ئەو کاتەی خودا ئادەم و حەوای خوڵقاند، دوو منداڵی پەرۆش بوون و بەدارەکانی باخچە گەورەکەدا هەڵدەزنان و بە نازەوە بەناو ئەو باخچەیەدا دەخولانەوە کە خودا بۆی خوڵقاندبوون. ئێ ئاخر هیچ مانایەکی نەدەبوو کە خاوەنی باخچەیەکی گەورە بیت و هیچ منداڵێک یاری تێدانەکات.
_ بەڕاستی وابوو؟
_ من لەوەوپێش وتم فریشتەکان درۆ ناکەن.
_ دە کەواتە زیاترێکم بۆ باسبکە!
_ دواتر مارەکە فریویدان کە لە بەری داری زانیاریەکە بخۆن و ئیدی لەوەبەدواوە گەورەبوون. هەتا زیاترێکیان دەخوارد، زیاترێک گەورەدەبوون. بەو شێوەیەش هێدی هێدی لە بەهەشتی منداڵی دورکەوتنەوە. ئەو دوو دزە بچکۆلەیە هێندە پەرۆشی زانیاریبوون، هەتا لەدواجاردا بەتەواوەتی لە بەهەشتدا خۆیان بەدەرکردندا.
سیسیلیا دەمیداپچڕیبوو و 'ئاریل'یش زۆر بەسەبر و سنگفراوانیەوە تەماشایەکی کرد، ئینجا وتی؛
_ بەڵام بێگومان ئەم بەشەت لەوەوپێش گوێ لێبووە.

سیسیلیا سەری بۆ ڕاوەشاند و وتی؛
_ ئەوەندەم بیستووە کە ئادەم و حەوا لە بەهەشت دەرکراون، بەڵام کەس پێی نەگووتوم کە لە بەهەشتی *سەردەمی منداڵی* دەرکراون.
_ ڕەمبێکم خۆت بتتوانیبایە ئەوە هەڵبهێنیت. بەڵام ئێوە هەروا هێواش هێواش لە شتەکان تێدەگەن. ئێوە هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکدا دەبینن، هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینن...
سیسیلیا هەروا پاڵکەوتبوو و بزەیەکی مەکراوی گرتبووی؛
_ بەلایەنی کەمەوە پێم وابێت ئەو کاتە دەبینم کە ئادەم و حەوا منداڵ بوون و لەنێوان درەختەکانی باخچە گەورەکەدا فڕکوهوڕیان بووە.
_ بزانە.. ئەی من وتم چی؟
_ چیت وت؟
_ پێموابێت هێندە بێئەقڵ نیت کە نەتوانیت شتەکان هەڵبهێنیت. تۆ دەزانی مرۆڤ ڕێژەیەکی زۆر کەمی مێشکی بەکاردەهێنێت؟
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند، چونکە دەربارەی ئەوەی لە گۆڤارە زانستیەکاندا خوێندبووەوە. پاشان داوای شتێکی لێکرد و وتی؛
_ دەمەوێت زیاترێکم دەربارەی ئادەم و حەوا بۆ باسبکەیت.
لەپاش سەختیەکی زۆر توانی کەمێک لەسەر جێگاکەی بەرزببێتەوە. ئاریل‌یش لەکاتی قسەکردندا لەسەر قاچە فرتێکەی خۆی هەر بەردەوامبوو؛
_ لەپێشدا لە هەموو لایەنێکەوە هێدی هێدی گەورەبوون و دواتریش ئەندامی زاوزێیان پێگەیی. ئەوەش بەشێک بوو لە سزاکەیان، بەڵام لەلایەکی ترەوە دڵنەواییەک بوو بۆ مرۆڤیش و بۆ خوداش.
_ بۆچی؟
_ چونکە لەوەبەدواوە دەیانتوانی مرۆڤی نوێ بهێننە ناو جیهانەوە. لەو کاتەشەوە تا ئێستا هەروا ماوەتەوە. بەو شێوەیەش خودا هێندەی دابینکردوە کە هەمیشە منداڵ لە جیهاندا هەبێت و بتوانن جیهان سەرلەنوێ بدۆزنەوە. بەدەر لەوەش بەو شێوەیە دڵنیابوو لەوەی کە

مەخلوقەکانی قەت بنەبڕ نابن. چونکە لەگەڵ لەدایکبوونی هەموو منداڵێکدا سەرلەنوێ جیهان دەخوڵقێنرێتەوە.
_ مەبەستت لەوەیە لەگەڵ لەدایکبوونی هەر منداڵێکدا، جیهان بە شێوەیەکی نوێ وەک شتێکی تازە دەبێت بۆ ئەو منداڵە؟
سەرێکی بۆ لەقاند:
_ بەڕاست.. زۆر بەئاسانیش دەتوانین بڵێین جیهان دێتە ناو منداڵەکەوە. لەدایکبوون وەک ئەوە وایە هەموو جیهان بەدیاری وەربگریت –بەهەموو شتێکەوە، بەخۆری ڕۆژەکان و مانگی شەوان و بە ئەستێرەکانی ناو ئاسمانی شینیشەوە. بە دەریایەکەوە کە ئاوەکەی بەلێشاو بەرەو کەنار دەریا دەڕوات، بە دارستانە چڕەکانەوە کە خۆشیان پەی بە نهێنیەکانی خۆیان نابەن، بە ئاژەڵە قەشەنگەکانەوە کە بەسەر زەویدا هەڵبەزو دابەزدەکەن. چونکە جیهان قەت پیر نابێت و سەری سپی بەخۆیەوە نابینێت. ئێوە پیردەبن و سەرتان سپی دەبێت. هەتاوەکو ئەو کاتەی منداڵ لەدایک ببێت، جیهان هەر ڕێک وەک ڕۆژی حەوتەمینی خەڵقکردن نوێیە، ڕێک وەک ئەو ڕۆژەیە کە خوا لە خەلق بووەوە و پشووی تێدادا.
سیسیلیا بە دەمێکی نیوە داپچراوەوە پاڵکەوتبوو، 'ئاریل'ی فریشتەش لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو؛
_ خۆ ئەو کاتە تەنها ئادەم و حەوا نەهاتنە ژیانەوە، بەڵکو کەمێک لە تۆش لەو کاتەدا خوڵقێنرا. لەناکاوێکدا ڕۆژێک لە ڕۆژان نۆبەی تۆ هات کە ئیشەکانی خالق ببینیت. خودا هەر زۆر بەئاسانی تۆی خوڵقاند و تۆش بەشێوەیەکی پڕ لە ژیان خۆتت لە ئاسماندا بینیەوە. هێندەشت بینی کە هەموو شتێک لەڕادەبەدەر باشە.
سیسیلیا پێکەنین گرتی و پرسی؛
_ بەڕاستی ئێوە هەمیشە لێرەدابوون؟
فریشتەکە زۆر بەجدی سەری بۆ لەقاند؛
_ بەڵێ، لێرەشدا بووین و لەوێشدا بووین. بەڵام ئێمە لەوەتەی هەین پەرۆشی زانینی هەموو ئەو شتانەین کە پەیوەندی بە مەخلوقەوە هەیە. بێگومان هەر دەبێت واش بێت، چونکە ئێمە هەموو شتێک

لەدەرەوەڕا دەبینین. لە نێوان هەموو ئەو شتانەی کە خەلق کراون، تەنها منداڵان وەک ئێمە پەرۆشی زانینن. بەڵام ئەوانیش بەشێوەیەک لە شێوەکان لەدەرەوەوە هاتوون.
سیسیلیا لەو کاتەوەی نەخۆشکەوتبوو زۆرجار شتێکی لەو بابەتەی بە خەیاڵدا دەهات؛ گەورەکان هەمیشە تێر تێر بیردەکەنەوە ئینجا بڕیاردەدەن شتێکی هەزەلی بکەن. هیچ شتێکی ئاوهاش درکپێناکەن کە بەتەواوەتی سەرسامیانبکات. هەر چیەک ڕوبدات هەر دەڵێن "ئاساییە سیسیلیا".
دواتر سیسیلیا وتی؛
_ خۆ خودا کەمێکیش گەورەکانی هەر خۆشدەوێت؟
_ بێگومان. هەرچەندە هەموو گەورەکان لەدوای گوناحەگەورەکەوە کەمێک پوکاونەتەوە.
_ پوکاونەتەوە؟
_ گەورەکان سەرتاپای جیهانیان کردۆتە خوویەک و هیچی تر. بەڵام بەلای ئێمەی فریشتەی ئاسمانەوە بەو شێوەیە نیە، هەرچەندە لەسەرەتای بوونیشەوە بوونمان هەیە. ئێمە ئێستاکەش سەرمان لەو شتانە سوڕماوە کە خودا ئافەراندوونی. بەڕاست.. خودا خۆشی هەتا بڵێیت سەرسامبووە. هەر لەبەرئەوەشە کە زیاتر دڵی بە منداڵ خۆشە و کەمترێک دڵێ بە گەورەکان دەکرێتەوە کە بە جیهان ڕاهاتوون و خوویان پێوەگرتووە.
سیسیلیا هەر بیری دەکردەوە و هەر بیری دەکردەوە، هەستیدەکرد سەری دەدرەوشێتەوە. لەو کاتەوەی نەخۆشکەوتبوو چەند جارێک مێشکی خۆی وەک شارێکی یاری پڕلەفیکری زۆرزانانە دەبینی. تەنها جیاوازیشی لەگەڵ شارێکی یاری ئاسایدا ئەوەبوو کە پێویستی بە کڕینی بلیت نەبوو بۆ ئەوەی خلیسکێنەکانی تاقیبکاتەوە.
ئاریل وەک ڕونکردنەوەیەک وتی؛
_ زۆرینەی گەورەکان هێندە خوویان بە جیهانەوە گرتووە کە هەموو ئافەریدەکان بە شتێکی ئاسایی دەبینن. کەمێک مایەی پێکەنینە کە

بیر لەوە بکەینەوە، چونکە ئەوان تەنها بۆ ماوەیەکی کەم سەردانی ئێرە دەکەن.

_ وایە، منیش وای دەبینم!

_ ئێمە باسی جیهان دەکەین سیسیلیا! مەگەر جیهان شتێکی سەرسوڕهێنەر نەبێت! ڕەنگە واباشتربێت ئاسمان زووزوو ئاگاداریەک لە ڕۆژنامە گەورەکاندا بڵاوبکاتەوە و بنوسێت؛ "ئاگاداریەکی گرنگ بۆ هەموو دانیشتوانی سەر زەوی! بەڕاستی جیهان تەنها دەنگۆیەک نیە؛ **جیهان ئێستاکە بوونی هەیە!"**

باسەکانی 'ئاریل'ی فریشتە سیسیلیای گێژکردبوو. هەروەها بینینی پێ پەتیەکانیشی کەمێک گێژیکردبوو، چونکە بەردەوام دەیلەراندنەوە و لەقەفرتێی بوو. وتی؛

_ باشە چاکترێک نەدەبوو ئەگەر خودا ئەو مارە قێزەوەنەی لە بەهەشت دەربکردایە؟ ئەو کاتە ئادەم و حەوا بۆ خۆیان بۆ هەتاهەتایە لەو باخچە مەزنەدا یاری چاوشارکێیان دەکرد..

ئاریل'ی فریشتە سەرێکی بۆ لارکردەوە و وتی؛

_ بەڕاستی هێندە ئاسان نەبوو. ئێوە لە لەش و خوێن دروستبوون و ناتوانن وەک فریشتەکانی ئاسمان هەتاهەتایە بمێننەوە. بەڵام خودا دڵی نەدەهات کە مردنی منداڵ بەشێک بێت لە دەستورنامەی ئافراندن. لەبەرئەوە هەرچۆنێک بێت واباشتربوو کە ڕێگەیان پێبدات لە پێشدا گەورەببن.

_ بۆچی؟

_ چونکە ماڵئاویی لە جیهان ئەو کاتە ئاسانترێک دەبێت کە پێنج شەش منداڵی منداڵەکانت هەبێت، ئیدی لەو تەمەنەدا شەکەت و گێژبوویت و ڕۆژگاریش بەتەواوەتی برستی لێبڕیوویت.

سیسیلیا هێندە زۆر سەرسامی ئەو قسانەی دواجاری فریشتەکە نەبوو، بۆیە وەک بەرپەرچدانەوەیەکی قسەکانی وتی؛

_ بەڵام هەندێ جار منداڵانیش دەمرن، باشە ئەوە دڵڕەقی نیە؟

ئاریل دەمودەست وەڵامی نەدایەوە، لەبەرئەوە سیسیلیا درێژەی بە قسەکانیدا؛

_ تۆ بەتەواوەتی دڵنیایت کە ئادەم و حەوا منداڵبوون؟
_ بەڵی هەر زۆر دڵنیام لەوە. تۆ قەت خەیاڵت بۆ ئەوە نەچووە کە منداڵ لەهەموو کەسێکی تر زیاترێک لە فریشتەکانی ئاسمان دەچێت؟ یان تۆ هەرگیز فریشتەیەکی سەر سپیت بینیوە، پشتی چەمابێتەوە و پێستی دەموچاوی چرچ و لۆچ بووبێت؟
شتێک لەو پرسیارەدا وای لە سیسیلیا کرد بەرەنگاری ببێتەوە؛
_ من پێم وانیە نەنکم ناشیرین بێت، هەرچەندە بەتەمەنیشە.
ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛
_ تۆ دەڵێیت "کە نەنکم ناشیرین بێت"، ئێ کوا ئێمە وامان گوت؟ بەهەرحاڵ لەناو لەشە بەتەمەنەکەیدا 'حەوا'یەکی بچکۆلەی تێدایە کە کاتی خۆی هەر زۆر نوێبووە لە جیهاندا. لەشیشی شتێکە کە لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵەکاندا لەدەرەوە گەشەیکردووە.
سیسیلیا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛
_ ئەگەر ڕێگەم پێبدرێت ڕای خۆم بڵێم، ئەوا پێم خۆشە بڵێم سەرتاپای "دەستورنامەی ئافراندن" هەتا بڵێیت شتێکی بێمانایە.
_ بۆ؟
_ من نامەوێت گەورەببم. بەلایەنی کەمەوە نامەوێت قەت بمرم! قەت!
دەموچاوی فریشتەکە تاریک بوو و وتی؛
_ هەولبدە پەیوەندیت لەگەڵ ئەو منداڵە بچکۆلەیەی ناوەوەتدا نەپچڕێنیت. نەنکت هێشتا ئەو پەیوەندیەی هەر ماوە. بەڕاست.. تەنها بۆ ئەوەی تۆ بخاتە پێکەنین، دێت و دەمامکێکی قەرەقۆزەکان لەسەردەکات، وا نیە؟
_ ئەو کاتەش تۆ لێرەدا بوویت؟
_ بەڵێ!

***

چرکەی دوای ئەوە فریشتەکە لەسەر زەویەکە وەستابوو. سیسیلیا نەیبینی کە لە مێزی نوسینەکەوە بێتە خوارەوە، هەر هێندەی زانی لەناکاوێکدا لەبەردەم کتێبخانەکەدا وەستاوە و لە کریستاڵەکان و بەردە دەگمەنەکانی وردەبێتەوە. فریشتەکە بە لەشولار کەمێک لە لاس بچکۆلەتربوو.

هەروا پشتی لێی بوو و وتی؛

_ کۆمەڵێک بەردی قەشەنگت کۆکردۆتەوە.

ئینجا ڕوی تێکرد و وتی؛

_ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە کە هەموو یەکێک لەم بەردانە بەشێکی بچکۆلەی زەویە؟
_ چەندەها جار بیرم لەوە کردۆتەوە. من بەردە هەرە جوانەکان کۆدەکەمەوە..
_ بەڵام وابزانم بیرت لەوە نەکردۆتەوە کە تۆش کەمێکی زەویت داماڵیوە؟
سیسیلیا داچڵەکی؛
_ بۆ؟
_ تۆ هەروا بێخەیاڵ بەسەر شتە خوڵقێنراوەکاندا دێیت و دەڕۆیت، ئەوەش لەوە زیاترێکە کە بەردێک بەرگەی بگرێت.
تەنها لەوێدا سیسیلیا دەموچاوی فریشتەکەی بەڕوونی بینی. زۆر لە دەموچاوی مرۆڤی ئاسایی سافتر و پاکتر بوو، کەمێکیش ڕەنگ پەڕیوتربوو. سیسیلیا هێواش هێواش چاوی لەسەر سەرە کەچەڵەکەی رادەهات. لەوێدا هێندەشی بۆ دەرکەوت کە برژانگ و پێڵوی چاویشی نیە.
بەرەوڕی هات و لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەیەوە دانیشت. هەنگاوەکانی هێندە نەرمبوون، هەر دەتوت قاچی بەر زەوی ناکەوێت، هەر لەوەدەچوو بە ناو ژورەکەدا بخلیسکێت. دوو چاوە شین و سەوزباوەکانی هەروەک دوو مرواری بەنرخ دەدرەوشانەوە. کە پێشدەکەنی بۆی، دانەکانی بەچەشنی مەرمەڕی سپی دەبریسکانەوە.
لەو کاتانەدا کە پێکەوە قسەیان دەکرد، سیسیلیا چەند جارێک هەر سەیری کەللە کەچەڵەکەی دەکرد. دواتر سیسیلیا وتی؛
_ ئاساییە بەلاتەوە ئەگەر پرسیارێکت دەربارەی قژت لێبکەم؟
فریشتەکە پێکەنی و وتی؛
_ ئاساییە، فەرموو بپرسە. دواتریش گەر پێتخۆشبێت باسی قژی تۆش دەکەین.
سیسیلیا سەیری لێفەکەی دەکرد و کەوتە قسەکردن؛
_ من وامدەزانی فریشتەکان قژێکی درێژی کاڵیان پێوەیە.

_ ئەوە لەبەرئەوەیە کە تۆ هەموو شتێک لە ڕوی ئاوێنەیەکەوە دەبینیت. بەوشێوەیەش هەرچۆنێک بڕوانیت هەر خۆت دەبینیت.
سیسیلیا وەڵامەکەی هێندە بەدڵ نەبوو؛
_ ئەتوانیت ڕاستەوڕاست پێم بڵێیت ئێوە بۆ قژ بەسەرتانەوە نیە؟
فریشتەکە لە وەڵامدا وتی؛
_ پێست و موو شتێکن کە لەسەر لەش گەورەدەبن و هەمیشەش لەپاشاندا هەڵدەوەرێن، شتێکن پەیوەندیان بە لەش و خوێنەوە هەیە و ئیشەکەیان ئەوەیە کە لەش لە باوبۆران بپارێزن، نەهێڵن سەرما و گەرمای ببێت. پێست و موو خزمایەتیەکیان لەگەڵ فەروی ئاژەڵاندا هەیە و نەلەدور و نە لەنزیک هیچ پەیوەندیەکیان بە فریشتەکانەوە نیە. بەڕاست.. هەروەک ئەوە وایە کە بڵێیت "ئێوە دانتان دەشۆن؟" یان "هەر دوو حەفتە جارێک نینۆکتان دەکەن؟"
_ وابزانم هیچ یەکێک لەوانە ناکەن، وایە؟
سەری بۆ ڕاوەشاند.
_ بەهەرحاڵ بەهۆی ئەو شتانەوە نیە کە من و تۆ لەیەک دەچین.
_ ئەی بەهۆی چیەوەیە؟
بەرەولای سیسیلیا سەری لارکردەوە و وتی؛
_ فریشتە و مرۆڤ خاوەنی ڕۆحێکن کە خودا خوڵقاندویەتی. بەڵام ئێوە لەشێکیشتان هەیە کە ژیانی تایبەتی خۆی دەژی. ئێوە هەر ڕێک وەک ڕوەک و گیانلەبەر گەورەدەبن و گەشەدەکەن.
سیسیلیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی؛
_ ئەوەش سەختە. من حەزم لەوە نیە بەو شێوەیە بیربکەمەوە کە گیانلەبەرێکم.
ئاریل هەروەک ئەوەی گوێی لە قسەکانی سیسیلیا نەبووبێت درێژەی بەقسەکانی خۆیدا؛
_ هەموو ڕوەک و گیانلەبەرەکان ژیانی خۆیان لە تۆوێکەوە یان لە خانەیەکی بچکۆلەوە دەستپێدەکەن. لەسەرەتادا هێندە لەیەک دەچن کە مەحاڵە جیاوازی نێوانیان ببینرێت. بەڵام پاشان هێدی هێدی ئەو تۆوە بچکۆلانانە خۆیان دەکەنەوە و دەبنە شتێکی تر، هەرلە دەوەنی

توترک و گوڵەوە تاکو و مرۆڤ و زەڕافە بەو شێوەیەیە. تۆ دەزانی چەند ڕۆژێک ڕادەبورێت ئەوجا جیاوازی نێوان کۆرپەڵەی زەڕافەیەک و مرۆڤێک دەردەکەوێت؟
سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ وابزانم لەماوەی چەند حەفتەی ڕابوردوودا جگە لە خوێندنەوەی گۆڤارە زانستیەکان هیچی ترم نەکردووە.
_ لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دوو مرۆڤێک بەتەواوەتی لەیەک ناچن، تەنانەت هیچ دوو بەرازێکیش پڕاوپڕ وەک یەک نین. لەهەموو دونیادا دوو چڵەگیای وەک یەک نابینیت.
سیسیلیا دیاریەکی باوکی بیرکەوتەوە کە کاتی خۆی چەند ساڵێک لەمەوبەر پێشکەشی کردبوو، کیسەیەکی پڕ لە هەڵماتی کاغەزینی یابانی بوو. هێندە بچکۆلەبوون کە هیچ جیاوازیەکیان نەبوو، بەڵام کە دەتخستنە ناو ئاوەوە هەڵدەئاوسان و چەندەها شێوە و ڕەنگی جیاوازیان تێدا دەردەکەوت. هیچ دوو دانەیەکیان لە یەک نەدەچوون.
دیسانەوە سیسیلیا وتیەوە؛
_ من وتم "حەزم لەوە نیە بەو شێوەیە بیربکەمەوە کە گیانلەبەرێکم".
ئاریل زۆر بە هێواشی دەستێکی خستە سەر لێفەکەی سیسیلیا و ئەویش بەئاستەم هەستی بە شتێک دەکرد کەلەسەر قاچی بێت.
_ سیسیلیا، تۆ گیانلەبەرێکیت و خاوەنی ڕۆحی فریشتەیەکیت. بەو شێوەیەش لەهەردوو بەشەکەت وەرگرتووە. بەلاتەوە خۆش نیە؟
_ نازانم..
_ لەڕاستیدا هەموو کارە هونەریەکە لە خودی ئەو تێکهەڵکێشانەدایە. تۆ لە کاتی ئاگایی تەواودا کتومت وەک فریشتەکانی ئاسمانیت؛ "ئێوارەت باش پیاوە گەنجەکە، من ناوم 'سیسیلیا سکۆتبوە'. ڕێگەدەدەن سەمایەکتان لەگەڵدابکەم؟"
'ئاریل'ی فریشتە دەستێکی بادا و لەڕادەبەدەر خۆی چاماندەوە. هەرلەوە دەچوو کە تازە لە قوتابخانەی سەماوە هاتبێتەوە. ئینجا بەردەوامی بەقسەکانیدا و وتی؛

_ بەڵام ئەو لەشەی کە تۆ تێیدا دەژیت لە گۆشت و خوێن پێکهاتووە، هەر ڕێک وەک لەشی مانگا و حوشتر. هەرلەبەرئەوەشە کە موو لەسەر لەشی تۆ سەردەردێنێت، بێگومان هەرە زۆرینەی لە سەرتدایە، بەڵام لە شوێنی تری لەشیشتدا گەشەدەکەن، هەرچەندە تەنها وەک سەرەتایەک بە کەمی دەردەکەون. دواتریش بەرەبەرە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا خێراتر و خێراتر دەبن سیسیلیا، بەگوڕتر و بەگوڕتر دەبن! سروشت هەروەک توێژاڵێک بەدەوری ئەو منداڵەدا گەشەدەکات کە کاتی خۆی لەدایکبووە، بەردەوامیش ئەو توێژاڵە ئەستورتر و ئەستورتر دەبێت. لەو چرکەیەدا کە خالق دەستتان لێبەردەدات و لەدایک دەبن، لەشتان هەروەک فریشتەکانی ئاسمان پاک و سافە. بەڵام تەنها وەک ڕوکەش، چونکە گوناحە گەورەکە هەر لە کاتی لەدایکبوونەوە دەستبەکارە. لەناو لەشتاندا گۆشت و خوێنی تێدایە و دواتر دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتوانن بۆ هەتاهەتایە بژین.

سیسیلیا گازی لە لێوی دەگرت. پێی خۆشنەبوو باسی ئەو جۆرە شتانە بکەن کە پەیوەندی بە لەشەوە هەیە. ڕقی لەوەش بوو کە خەریکبوو گەورەدەبوو.

_ 'لاس' هەتا دوو ساڵی پڕنەکردەوە یەک تاڵ قژ بەسەریەوە نەبوو.

_ دەزانم.. پێویست ناکات باسی ئەوەم بۆ بکەیت.

_ کەواتە لەوانەیە ئەوەش بزانیت کە من لە خەستەخانە دەرمانیان دامێ و دواتر قژمی هەڵوەراند.

سەری بۆ لەقاند؛

_ بەو شێوەیەش من و تۆ زیاترێک لە یەکتری دەچین.

_ لە ڕاستیدا دەبوایە کەرەتێکی تریش هەمان ئەو دەرمانانەم بخواردایە، بەڵام دواتر ڕامان گۆڕی..

_ ئەوەش دەزانم.

_ نەنکم قەناعەتی بە هەموویان کرد، بە دکتۆرەکانیش. نەنکم هەر ئەوەندەی دەستی بەبابەتێک کرد ئیتر وازناهێنێت و بەردەوامدەبێت لەسەری. دواتر شتەکانمان کۆکردەوە و هاتینەوە ماڵەوە. بەڵام

'کریستینا' هەموو حەفتەیەک چەند جارێک دێتە لام. ئەو سیستەرە و...

_ هەموو ئەوانەش دەزانم.

سیسیلیا سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی سەقفی ژورەکەی کرد. بۆ ماوەیەک هەر بە پاڵکەوتنەوە بیری لە هەموو ئەو شتانە کردەوە کە لە چەند مانگی پێشوودا ڕویاندابوو. پاش نەختێک دیسانەوە ئاوڕی لە ئاریل دایەوە؛

_ تۆ بەتەواوەتی لەوە دڵنیایت کە فریشتەیەکی ڕاستەقینەیت؟

_ من وتم فریشتەکان درۆ ناکەن.

_ بەڵام ئەگەر درۆ بکەیت، کەواتە فریشتە نیت، ئێ خۆ ڕێی تێدەچێت کە درۆبکەیت.

ئاریل هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛

_ ئاە.. چەندە گومانەکانتان بەشێوەیەکی ئاڵۆز لەناختاندا ڕەگی داکوتیوە!

سیسیلیا لەناکاودا هەستیکرد موچوڕکەیەکی ساردی بەلەشدا هات، بڵێیت لەبەرئەوە بووبیت کە گومانی هەبوو؟

سیسیلیا وتی؛

_ دەکرێت پرسیارێکی بێمانات لێبکەم؟

_ هەرگیز پرسیارکردن بێمانا نیە.

سیسیلیا یەکسەر چووە ناو بابەتەکەوە؛

_ تۆ کچیت یان کوڕ؟

ئاریل قاقایەکی لێدا. دەنگی پێکەنینەکەی دەنگی ئەو بتڵەی بیرخستەوە کە کەڕەتیکیان ئاوی تێکردبوو و تەپڵی پێلێدەدا. پێکەنینەکەی زۆر بەلاوە خۆشبوو، لەبەرئەوە دیسانەوە پرسیەوە؛

_ تۆ کچیت یان کوڕ؟

لەوەدەچوو بەتەواوەتی سیسیلیا بخوێنێتەوە، چونکە بەرلەوەی وەڵامی بداتەوە کەمێکی تریش پێکەنی، بگرە زۆر توندتر پێکەنی.

_ پرسیارەکەت هەر زۆر دونیایی بوو.

سیسیلیا هەستیکرد غەدری لێکراوە، ئێ ئەو خۆی نەیگوت هیچ پرسیارێک بێمانا نیە؟
پاشان ئاریل وتی؛
_ ئەو جۆرە جیاوازیە سەیر و سەمەرانە لە ئاسماندا بوونیان نیە، بەڵام دەتوانیت بە "کوڕ"م دابنێیت، بەو شێوەیەش من و تۆ هەردوو ڕەگەزەکە پێکدەهێنین.
_ ئەی باشە بۆ لێرەدا ئەو جۆرە "جیاوازیە سەیروسەمەرانە" هەیە؟
_ ئێ لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد. بۆ ئەوەی منداڵی نوێ لەدایک ببن، دەبێت دوو ڕەگەزمان هەبێت. تۆ خۆشت ئەوە دەزانیت سیسیلیا. لەڕاستیدا باسکردنی ئەو بابەتە بەلای فریشتەیەکەوە هێندە خۆش نیە.
_ ببورە!
_ هەر زۆر ئاساییە. بێگومان خودا هیچ جیاوازیەکی لەنێوان کوڕ و کچدا دروستنەدەکرد ئەگەر مەبەستەکە لەوەدا نەبوایە کە گەورەببن و ببنە پیاو و ژن و پاشان منداڵ بخەنەوە. وابزانم ڕێک لەو کاتەدا کە ئەوەی کردووە، هیچ ڕێگاچارەیەکی تری لەبەردەستدا نەبووە و ناچاربووە هەر بەو جۆرە بیکات.. باشە تۆ خۆت دەتوانیت لەو بارەیەوە پێشنیاری شتێکی تر بکەیت؟
_ نازانم.
لەوێدا فریشتەکە زۆر بەگوڕ قسەی دەکرد؛
_ بێگومان ئەگەر لەڕێگەی گۆپکەکردنەوە بهاتنایەتە بوونەوە، ئەو کاتەش هەر دەتپرسی "باشە بۆ بەو شێوەیە هاتووینەتە بوونەوە؟" بەڵام بەهەر شێوەیەک بوایە، پێی دەچوو ئێستاکە هەموو شتێک جیاوازبوایە. بۆ نمونە دەکرا لەبری ئەوەی لەسەر زەوی بژین لە ژێر زەویدا بژیبانایە. بێگومان ئەگەر هەل و مەرجی گونجاو هەبووایە، ئەو کاتە بەئاسانی دەکرا شار و کێڵگە لە ژێر زەویدا بنیاتبنرایە. وە ئەگەر هەل و مەرجەکانیش گونجاو نەبوونایە، ئەو کاتە دەکرا بەشێوەیەک لە شێوەکان گونجاوی بکەن. ئاشکرایە خولقاندنی

جیهانێک هونەرێکی بەرزە، بەڵام لە هەموو بارێکدا لەسەرەتای سەرەتاوە دەستپێدەکرێت.
سیسیلیا وتی؛
_ بیرکردنەوە لەوە شێتێتیە. هەتا زیاتریش بیری لێدەکەمەوە، شێتانەتر دێتە بەرچاوم.
_ چی شێتانەیە؟
_ کە دوو جۆر ڕەگەزی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە بوونی هەیە.
هەروا دانیشتبوو و خەندەیەکی مەکراوی بەدەمووچاویەوە دیاربوو؛
_ ئەوەش یەکێکە لەو شتانەی کە تا ئێستاش ئێمە لە ئاسماندا گفتوگۆی لەسەر دەکەین. بەڵام بە هەمان شێوە نا.
_ بۆ نا؟
_ چونکە ئێمە باسی خۆمان ناکەین و باسی شتێکی جیاوازتر دەکەین.
من وای بۆ دەچم شتێکی زۆر نهێنی ئامێزتربێت ئەگەر شێوەی بوونی خۆتت بەلاوە سەیربێت. من پێم وانیە بەردێک هەبێت و بەلایەوە سەیربێت کە وەک بەرد بوونی هەیە. گومانیشم لەوە نیە کە کیسەڵێک بەهیچ جۆرێک بوونی خۆی بەلاوە سەیربێت. بەڵام هەندێ کەس بەلایانەوە سەیرە کە مرۆڤن. من بەتەواوەتی تەبام لەگەڵیاندا. من هەرگیز لەهەستی بەردێک یان کیسەڵێک تێنەگەیشتووم.
_ ئەی پێت وانیە بوونت وەک فریشتەیەک سەیربێت؟
ساتێکی پێچوو ئەوجا وەڵامی دایەوە؛
_ ئەوەیان شتێکی تەواو جیاوازە، چونکە من لەوەتەی هەیە هەر فریشتەبووم. بەڵام تۆ ماوەیەکی کەمە کە 'سیسیلیا سکۆتبوٚیت.
_ ڕاستە! بەڵام هێشتا پێموایە بوونی خۆم هەر زۆر پڕنهێنی بێت.
ئاریل وتی؛
_ بێگومان سەرتاپای هەبوون خۆی لە خۆیدا مەتەڵێکی مەزنە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو شتێک سەیروسەمەرەتر ئەوەیە کە لە قەراغ و چواردەوری ئەو مەتەڵەدا چەند مەخلوقێک هەن کە خۆیان وەک مەتەڵێک دەبینن.
_ بۆچی ئەوە شتێکی هێندە سەیرە؟

ـ ڕێک وەک ئەوە وایە کە بیری ئاوێک بتوانێت بچێتە ناو قوڵایی سەیروسەمەرەی خۆیەوە.
سیسیلیا بەدڵنیاییەوە وتی؛
ـ من خۆم چەندەھاجار ئەوەم کردووە.
ـ چۆن چۆنی؟
ـ لەبەردەمی ئاوێنەیەکدا دادەنیشتم و تەماشای ناو چاوی خۆمم دەکرد. لەو کاتەدا خۆمم وەک بیرێکی ئاو دەھێنایە بەرچاوی خۆم، بۆیە خۆم بە خۆمم دەگوت ئەو بیرە ھێندە قوڵە کە ناتوانێت خۆی سەیری قوڵایی بنی بنەوەی خۆی بکات.
ـ بێگومان بەھۆی ئەوەوەیە کە تۆ بەردەوام گۆڕانکاریت بەسەردا دێت. لەکاتێک کە بەردەوام کەمێک گۆڕانکاریت بەسەردابێت، ئەو کاتە شتێکی ھێندە سەیر نیە کە کەمێک سەرت بسوڕمێت. ئەگەر کرمۆڵەیەک بیتوانیبایە بیربکاتەوە، ئەوا بێگومان ئەو ڕۆژەی کە لەناکاودا دەبووە پەپولەیەک کەمێک سەری نەدەسوڕما، بەڵکو ھەر زۆرزۆر سەرسامدەبوو. وەک دەزانیت گۆڕانکاریەکی ئاوھا لە ڕۆژێکەوە بۆ ڕۆژێکی تر ڕوودەدات. بەڵام فریشتەکانی ئاسمان بەھەمان شێوە سەریان لەوە دەسوڕمێت کە لە پڕێکدا کچێکی بچکۆلە دەبێتە ژنێکی گەورە. ئەو جیاوازیە بچکۆلەیەی کات بەلای ئێمەوە ھێندە زۆر نیە.
ـ بۆ نا؟
ـ چونکە فریشتەکان لەڕادەبەدەر کاتیان ھەیە سیسیلیا، ھەروەھا جیاوازیەکی یەکجار گەورە لە نێوان کچێکی بچکۆلە و ژنێکی گەورەدا ھەیە.
ـ ئێوە بەڕاستی لە ئاسماندا باسی ئەو جۆرە شتانە دەکەن؟
ئاریل بەشەرمەوە سەرێکی بۆ لەقاند. سەیرێکی ژورەکەی کرد و پاشان وتی؛
ـ بەڵام ھەوڵدەدەین ئەو باسانە لەو کاتانەدا نەکەین کە خودا لە چواردەورماندایە. ئەو بەرامبەرە بە ڕەخنە *ھەر زۆر* ھەستیارە.
ـ قەت لەو بڕوایەدا نەبووم.

_ ئێوە باوەڕ بە زۆر شت دەکەن. بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبن کە هێندەی فریشتەکانی ئاسمان تێگەیشتنتان هەبێت.
_ مەبەستم لەوەیە کە من پێم وابوو خودا لەسەرو هەموو ڕەخنەیەکەوەبێت.
_ ئێ خۆ تۆ قەت ڕوبەڕو خوات نەبینیوە. بەڵام ئەگەر تۆش سەرتاپای جیهانێکت بخوڵقاندایە، ئەو کاتە بێگومان کەمێک هەستیاردەبوویت بەرامبەر بە ڕەخنە. لێرەدا مەبەستمان لە بابەتی سەخت و دژوارە و شتێکی ئاسایی باسناکەین. ڕاستە خودا دوای ئەوەی کە هەموو شتێکی خوڵقاند، تەماشایەکی کارەکانی کرد و لەڕادەبەدەر پێی باشبوو، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نابەخشێت کە نەدەکرا شتێک لە شتەکان بەشێوەیەکی جیاوازتربوایە. پاش ئەوەی هەموو شتێکی خوڵقاند هێندە ماندووبوو کە ناچاربوو لە ڕۆژی حەوتەمدا پشووبدات. لەڕادەبەدەر هیلاک و شەکەت و ماندووبوو، تەختبوو تێدەگەیت؟ پێم وابێت بەرلەوەی کەرەتێکی تر هەوڵبداتەوە، ماوەیەکی یەکجار زۆر تێدەپەڕێت.
سیسیلیا لەناو بیرکردنەوەکانی خۆیدا بوو. وتی؛
_ بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر تەنها یەک ڕەگەز هەبوایە. یان سێ ڕەگەز هەبوایە، وابزانم بەو شێوەیە باشترین حاڵەت دەبوو.
_ تۆ خۆت پێت وانیە کە بەم شێوەیەی ئێستا پیاو و ژن دەتوانن لەڕادەبەدەر هەراوهوریا بنێنەوە؟
_ ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە ئەو هەموو هەراوهوریایەیان بێت چونکە تەنها دوو ڕەگەز بوونیان هەیە، بەتایبەتیش لەو حاڵەتانەدا دەنگەدەنگ زۆرە کە منداڵی زۆر لە خێزانەکاندا هەن. لەوە ناچێت تۆ هێندە زۆر شارەزایی ژیانی سەر ئەم زەویە بیت.
ئاریل شانێکی بۆ هەڵتەکاند و وتی؛
_ ئێ منیش دەمەوێت زیاترێک لەو بارەیەوە فێرببم.
سیسیلیا لەسەر قسەکەی سوربوو و وتی؛
_ ئەگەر لەدایک بوونی منداڵ بەهۆی بوونی سێ ڕەگەزەوە بوایە، ئەو کاتە دڵنیام وەک ئێستاکە هێندە زۆر منداڵ لەدایک نەدەبوون،

ئەوەش بەر لە هەموو شتێکی تر دەبووە یاریدەدەرێکی گەورە بۆ ئەوەی هێندە ژمارەی دانیشتوان زیادی نەکردبایە..
لەوێدا ئاریل وەڵامی دایەوە وتی؛
_ بەیارمەتیت کەمێک بوەستە.. تۆ هەر زۆر خێرا دەڕۆیتە پێشەوە.
سیسیلیا لەبێزاریدا هەناسەیەی هەڵکێشا.
_ وامدەزانی فریشتەکان دەتوانن لەگەڵ باسەکاندا بڕۆن.
_ لەو کاتانەدا نا کە ئێوە باسی لەدایکبوونی منداڵ و ئەو شتانە دەکەن. لەو کاتانەدا ئێمەی فریشتە هێندەی بکرێت لە ئاسمانەوە دورین.
_ مەبەستم لەوەیە پێویستمان بە شتێکی زیاتر دەبوو بۆ ئەوەی سێ کەس هێندە حەز لەیەکتری بکەن کە منداڵ دروستبکەن، واتە وەک ئەوە نەدەبوو کە تەنها دوو کەس حەز لەیەکتری بکەن و تەنانەت بەر لە کامڵبوونیشیان منداڵ بخەنەوە.
_ کەواتە باس لە شتێکی ماتماتیکی پەتی دەکەیت. مەبەستت لەوەیە دوو ڕەگەز کە حەزدەکەن منداڵیان ببێت، نەیانتوانیبایە بەبێ هاریکاری ڕەگەزێکی تر منداڵ دروستبکەن؟ تۆ مەبەستت لەوەیە؟
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ بۆ نمونە ئەگەر دوو لەو ڕەگەزانە پێیان خۆشبوایە منداڵ دروستبکەن، ئەو کاتە پێیدەچوو ڕەگەزی سێهەم بڵێت؛ "نەخێر ئازیزانم، با بەلایەنی کەمەوە یەکێکمان بەشێوەیەکی ئەقلانی بیربکاتەوە. دەبێت یەک دوو ساڵی تر چاوەڕوانبین. من ڕازی نیم لە ئێستادا منداڵی ترمان ببێت، چونکە هەر زۆرزۆر سەرمان قاڵ دەکەن".
سیسیلیا خۆی پێنەگیرا و خۆی بە قسەکانی خۆی کەوتە پێکەنین، پاش کەمێک پێکەنینەکەی 'ئاریل'یشی گرتەوە.
_ ئێمەش جارجارێک لە ئاسماندا کتومت بیر لەو شتە هەزەلیانە دەکەینەوە.
بەڵام سیسیلیا درێژەی بە قسەکانیدا و زیاترێکی لەو بارەیەوە پێبوو تا لێیانەوە بدوێت؛

_ جگەلەوەش هەر بۆ نمونە لەو کاتانەدا کە منداڵێک نەخۆش دەکەوێت، کەسێکی تریش ئاگای لە منداڵەکە دەبێت. ئەو کاتە دوانیان دەتوانن بەتەنیا کەمێک کات لەگەڵ یەکتریدا بەرنەسەر و دایکە یان باوکەی سێهەمیش ئاگای لە منداڵەکە ببێت.. ئەو کاتە خەڵکانێکی زیاتر منداڵەکانیان خۆشدەوێت. هەر بەشێوەیەکی گشتیش خەڵکانێکی زیاتر یەکتریان خۆشدەوێت.

دەموچاوی ئاریل بەشێوەیەکی پڕلەنهێنی دەهاتە بەرچاو. هەر لەوەدەچوو کە لەوەتەی بوونی هەیە ڕێک بەو ماسکەوە بووبێت. دواتر وتی؛

_ ڕاستە کە خەڵکی تەنها خێزانەکانی خۆیان بەلاوە مەبەستە؟

_ ڕەنگە وا نەبێت، بەڵام بێگومانم ئەو کاتەی کە سێ یان چوار دایک و باوک هەبوونایە، خۆشەویستیەکی زیاتر لە جیهاندا دەبوو. هەر ئەوەندەیە کە..

_ کە چی؟

_ ..هەر ئەوەندەیە کە ئەو کاتە خەم و خەفەتیش زیاترێک دەبوو.

_ خەم و خەفەت؟

سیسیلیا دیسانەوە گازی لە لێوی گرتەوە و ئەوجا وتی؛

_ ئەو کاتە کە کەسێک دەمرێت خەڵکانێکی زیاتر خەفەتدەخۆن.

ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛

_ وا جارێکی تریش هەستدەکەم تۆ زۆر خێرا دەڕۆیت.

_ بۆ؟

_ ئەگەر وا بوایە، ئەو کاتە دوو ئەوەندە دڵنەوایی و سۆز لە جیهاندا دەبوو.

_ بەو شێوەیەش ڕەنگە حاڵەتەکە هاوسەنگ بوەستایەتەوە.

ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند.

_ بەڵام ئەگەر هەموو خێزانێک تەنها دوو منداڵی ببوایە، ئەو کاتە لە کۆتایدا هیچ مرۆڤێک لە جیهاندا نەدەمایەوە.

_ بۆ نا؟

_ ئەگەر هەر سێ کەسی گەورە دوو منداڵی ببوایە، ئەو کاتە هێواش هێواش ژمارەی مرۆڤ کەمیدەکردەوە. تا وایلێدەهات لەدواجاردا بەتەواوەتی بنەبڕدەبوون.
سیسیلیا پێکەنی.
_ تا ڕۆژێک دەهات و تەنها یەک ئادەم و یەک حەوا دەمایەوە، کتومت وەکو ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمینجار سەریانهەڵدا. ئەو کاتەش ئەگەر لە هەموو گوناحە بۆماوەکانیان ببەخشرانایە، دەیانتوانی بۆ هەتاهەتایە لە بەهەشتدا بمێننەوە. بەڕاست باشی بۆ نەچووم؟
_ با زۆر خراپ نەبوو. بەڵام ئێستاکە باسی شێوازی ڕێکخستنی خەلق دەکەین.
_ ئەوەشیان هیچ سودێکی نیە؟ تۆش تارادەیەک هەروەک دایکم قسەدەکەیت. ئەو دەڵێت؛ هیچ 'سود'ێکی نیە گلەیی لەوە بکەیت کە نەخۆشیت. بەڵام چیتر تاقەتمان نیە باسی نەخۆشی و ئەو شتانە بکەین.
_ من هیچ شتێکم دەربارەی نەخۆشی باسنەکرد. بەڵام پەیمانت دەدەمێ ئەم جارەیان کە قسە لەگەڵ خودادا بکەم ناوی ئەو سێ ڕەگەزە دەهێنم. ئەو بەلایەنی کەمەوە خاوەنی مەزاجێکی خۆشە.
_ بەڕاستی وایە؟
زۆر بەسەبرەوە خەندەیەکی بۆ کرد و وتی؛
_ تۆ قەت فیلت نەدیوە؟ خۆزگە دەتزانی چەندە نوکتەمان لە ئاسماندا لەسەر فیل هەیە. بەڕاست، لەسەر زەڕافەش نوکتەمان زۆرە.
سیسیلیا خۆشی نەیدەزانی ئەو حاڵەتەی بەلاوە جوانە کە فریشتەکانی ئاسمان نوکتە لەسەر مەخلوقاتەکان دادەنێن یان نا. وەک شتێکی ئاسان دەهاتە بەرچاوی. ئینجا وتی؛
_ هیوادارم نوکتە لەسەر من نەکەن.
_ بێگومان نەء، من تا ئێستا هیچ نوکتەیەکم دەربارەی سیسیلیا گوێ لێنەبووە. بەڵام هەرچەندە تۆ هێواش هێواش لە شتەکان دەگەیت، گومانم نیە کە هێندە تێدەگەیت کە ئێستاکە تازە درەنگە بۆ ئەوەی شێوازی خەلق بگۆڕدرێت.

_ لەوانەیە..
_ نهێنیەکت پێ بڵێم؟
_ زۆریشم پێخۆش دەبێت.
_ هەندێ جار کە باسی شتەکانی ئێستا دەکەین و باسی ئەوەش دەکەین کە دەکرا بە چ شێوەیەکی تر بوونایە، خودا لە ناچاریدا دەستی ڕادەوەشێنێت و دەڵێت؛ "من خۆشم باش دەزانم کە فلاّن شت و فیسار شت دەکرا کەمێک جیاوازتر بوونایە، بەلاّم تازە کار لە کار ترازاوە و شتەکان ڕویانداوە، ئێ خۆ منیش خاوەنی دەسەلاّتی پەتی نیم".
سیسیلیا سەری سوڕما؛
_ پێم وانیە تەنانەت یەک قەشەش بەوە ڕازی بێت.
_ کەواتە یان قەشەکان هەڵەن یان خودا.
سیسیلیا دەستێکی بەدەمیەوە گرت و هەناسەیەکی توندی دایەوە، لەهەمان کاتدا فریشتەکە لەناکاودا دەموچاوی گرژبوو و وتی؛
_ دایکت کەمێکی تر دێتە ئێرە. باشترە بەپەلە بڕۆم..
_ من گوێم لە هیچ شتێک نیە.
_ بەلاّم وا بەرەو ئێرە دێت.
سیسیلیا گوێی لە زەنگی کاتژمێرێک بوو کە لە ژورەکەی تەنیشتیەوە لێیدەدا.
_ تۆ دەڕۆیت؟
سەرێکی بۆ ڕاوەشاند؛
_ لەسەر پەنجەرەکە دادەنیشم.
_ باشە دایکم دەتوانێت بتبینێت؟
_ پێم وانیە بتوانێت.
چرکەی دوای ئەوە دایکی سیسیلیا لە ژورەکەدا بوو؛
_ سیسیلیا؟
_ ئممم..
_ گڵۆپەکەت داگیرساندووە؟
_ ئێ خۆ خۆت دەیبینیت، ئیتر بۆ لە من دەپرسیت؟

_ هەر ویستم سەرێکت لێبدەم و بزانم وەزعت چۆنە.
_ بەیانیە؟
_ کاتژمێر سێیە.
_ بەڵام گوێم لە زەنگی کاتژمێرەکەبوو.
_ من خۆم خستبوومە سەر سێ.
_ بۆ؟
_ چونکە خۆشم دەوێیت. ناتوانم بە درێژایی شەوێک جێت بهێڵم و نەتبینم، بەتایبەتیش شەوێکی جەژن.
_ دایە، بڕۆرەوە ژورەکەی خۆت و دیسانەوە بخەوە.
_ ئەگەر بڕۆم تۆش دەخەویت؟
_ جارجارێک دەخەوم و هەندێ جاری تریش بەخەبەرم. بەڕاستی چیتر ئەو دوو حاڵەتەم بۆ جیاناکرێتەوە.
_ هیچت پێویست نیە؟
_ ئاوم لایە..
_ ناتەوێت بچیتە تەوالێت؟
سەری بۆ ڕاوەشاند.
_ زۆر خۆش گۆرانیتان دەگوت. هەرچەندە نەنکم پیانۆی لێدەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەو بردمیەوە.
_ کەمێک پەنجەرەکەت بۆ بکەمەوە تا هەوای پاکت بۆ بێت؟
_ بەڵێ کەمێک بیکەرەوە.
ڕۆیشتە لای پەنجەرەکەوە. سیسیلیا لەو بڕوایەدابوو دایکی لەسەر پەنجەرەکە ئاریل ببینێت، بەڵام هەتا دایکی زیاترێک لە پەنجەرەکە نزیک دەبووەوە، ئەو زیاترێک لەبەرچاودا وندەبوو.
دایکی وتی؛
_ ئای.. سەهۆڵی سەر پەنجەرەکە دەبینیت؟ هەر لە شێوەی گوڵ دەچێت. سەیر نیە هەر خۆیان ئاوها خۆیان دەنەخشێنن؟
پەنجەرەکەی کردەوە.

ـ زۆری شتی سەیر هەیە دایە. بەڵام لەوەدەچێت لەگەڵ ئەم نەخۆشیەمدا هەموو شتێک باشترێک تێبگەم. لەوەدەچێت دیمەنی هەموو جیهان ڕونترێک بووبێت لەبەرچاومدا.

ـ زۆرجار بەو شێوەیەیە. هەر کە هەڵامەتێکی سەختمان توشدەبێت، خێرا دەنگی بولبولەکانی دەرەوە بەشێوەیەکی تر دێتە بەرگوێمان.

ـ پێم وتیت پۆستەچیەکە دەستی بۆ ڕاوەشاندم؟

ـ ئا،ئا، باسی ئەوەت بۆ کردم.. دەی، وا پەنجەرەکە دادەخەمەوە.

گەڕایەوە لای جێگاکە و دەستی کردە ملی سیسیلیا.

ـ خەوێکی خۆش. کاتژمێرەکە دەخەمە سەر حەوت.

ـ پێویست ناکات. ئێ جەژنە ئیتر.

ـ منیش ڕێک لەبەرئەوە حەزدەکەم. بەڵام دەزانی چی سیسیلیا..

ـ چی؟

ـ دەڵێم بۆ جێگای خەوەکەت نەگوێزینەوە بۆ ژورەکەی خۆمان؟ ڕەمبێکم بەو شێوەیە بۆ تۆ خۆشترێک بێت.. کەمێکیش ئاسانتربێت بۆ من و باوکت.

ـ باشە ناتوانن بێنە ئێرە بۆ لام؟

ـ بێگومان دەتوانین. بە ئارەزوی خۆت پێویستت بە هەر شتێک بوو زەنگێکمان بۆ لێبدە و دێین بەدەمتەوە.. تەنانەت ئەگەر نیوەشەویش بێت.

ـ ئا، ئا، بەڵام دایە..

ـ چی؟

ـ ئەگەر من خودا بوومایە بەشێوەیەک ژیانم دەخوڵقاند کە هەموو منداڵێک بەلایەنی کەمەوە سێ دایک و باوکی هەبوایە.

ـ بۆ وا دەڵێیت؟

ـ بەو شێوەیە ئێوە هێندە هیلاک نەدەبوون. بەو جۆرە تۆ و باوکم دەتانتوانی کەمێک بەتەنها بۆ خۆتان پێکەوەبن و باوکی سێهەم یان دایکی سێهەم ئاگای لە من و لاس بوایە.

ـ شتی وا مەڵێ.

_ بۆ نا؟ من دەزانم تازە مەحاڵە شێوازی خەلق بگۆڕدرێت. هەر لەبەرئەوەشە کە هەندێ جار پێموایە خودا گەمژەیەکی گەورەیە. تەنانەت دەسەڵاتی پەتیشی نیە.
_ وابزانم بەهۆی نەخۆشیەکەتەوە کەمێک تورەیت.
_ کەمێک؟
_ باشە زۆر تورەیت.. شەو شاد ئیتر. سیسیلیا، تورەبوون سودی نیە.
_ "سیسیلیا، تورەبوون سودی نیە"، سەد جار لەوەوپێش ئەوەت پێ وتووم.
_ بەڵام من هیوادارم و دوعا دەکەم کە تۆ چاک ببیتەوە. هەموومان بەو شێوەیە بیردەکەینەوە.
_ بێگومان چاک دەبمەوە. بەڕاستی ئەوە یەکێکە لەو قسە ڕەقانەی کە دەمێکە پێمی دەڵێیت.
_ بەیانی 'کریستینا' دێت و دەرزیەکت لێدەدات.
_ بزانە.. چیم وت!
_ چی؟
_ خۆ تۆ پێت وانیە ئەو لە ڕۆژی یەکەمی جەژندا ئەو هەموو ڕێگایە ببڕێت و بێت بۆ لام، ئەگەر پێی وا نەبێت دەرمانەکانم یارمەتیم دەدات. تۆ هەر زۆر بێئەقڵیت، دایە. هەر لەبەرئەوەی کە زۆر ژیاویت، لەڕادەبەدەر شێتیت.
_ بێگومان لەو بڕوایەدایە کە دەرمانەکەت یارمەتیت دەدات. منیش لەو بڕوایەدام.. بەڕاست ناتەوێت جێگاکەت ببەینە ژورەکەی خۆمان.
_ من وا گەورە دەبم! لەوە تێناگەیت کە ژوری تایبەتی خۆمم دەوێت؟
_ بەڵی، بێگومان لەوە تێدەگەم.
_ بەراستی هێندەش خۆش نیە کە لەلای ئێوەوە پاڵبکەوم و گوێ لە پرخەپرخی ئێوە بگرم.
_ لەوەش تێدەگەم.
_ یەکجار هێندە قورس وەریمەگرە.. بەڕاست، سوپاستان دەکەم کە ئەو هەموو دیاریەتان بۆ کڕیبووم.
_ گڵۆپەکە بکوژێنمەوە؟

_ نەء، من خۆم ئەیکوژێنمەوە. هەر کاتێک لە بیرکردنەوەکانم تەواوبووم گڵۆپەکە دەکوژێنمەوە.

***

هەر ئەوەندەی دایکی گەڕایەوە ژورەکەی خۆی، سیسیلیا بەدەستەکوتێ قەڵەم و دەفتەری یاداشتەکەی لەژێر جێگاکەیدا دەرهێنا و کەوتە نوسین؛

هەموو چرکەیەک کۆمەڵێک منداڵی هەر زۆر نوێ بەئاسانی لە سروشتەوە دێنە دونیاوە. هەر وەک جادویەک دێن! هەموو چرکەیەکیش هەندێ خەڵک ون دەبن. سیسیلیا، بە ڕیزی درێژ درێژ لە ڕیزەکەدا دێنە دەرەوە..
ئێمە نایەینە ناو جیهانەوە، بەڵکو جیهان دێتە ناومانەوە. لەدایکبوون وەک ئەوە وایە کە هەموو جیهانت بەدیاری پێببەخشن.
هەندێ جار خودا لە ناچاریدا دەستی بادەدات و خۆی بە خۆی دەڵێت؛ "من خۆشم باش دەزانم کە فلان شت و فیسار شت دەکرا کەمێک جیاوازتر بوونایە، بەڵام تازە کار لە کار ترازاوە و شتەکان ڕویانداوە، ئێ خۆ منیش خاوەنی دەسەڵاتی پەتی نیم".

سیسیلیا قەڵەم و دەفتەرەکەی خنەیەوە ژێر جێگاکە و دیسانەوە سەرخەوێکی بۆ شکاندەوە.
خەبەری بووەوە و چاوی کردەوە، بەڵام نەیدەزانی چەندێک خەوتبوو. ڕوناکی گڵۆپەکەی سەر دارە گەورەکەی حەوشەکەیان بە لێشاو دەهاتە ژورەوە. گوڵە بەفرینەکانی سەر پەنجەرەکەش هەردەتوت لە ئاڵتون دروستکراون.
بەچرپەیەک وتی؛
_ ئاریل.
_ لێرەدام.
_ ئەی بۆ ناتبینم؟
_ لێرەدام..
ئەوجا چاوی پێکەوت. زۆر بەجوانی بۆ خۆی لەسەر ڕەفەی سەری سەرەوەی کتێبخانەکەدا پاڵکەوتبوو، لەوێدا هیچ کتێبێکی لێنەبوو.
_ چۆن چوویتەتە ئەو سەرەوە؟
_ بەلای فریشتەوە ئەوە هەر کێشە نیە... باش خەوتیت؟
چرکەی دوای ئەوە لەسەر عەرزەکە بوو. سیسیلیا نەیبینی کە خۆی هەڵبداتە خوارەوە، گوێشی لە هیچ تەپەیەک نەبوو. هەروا لە ناکاودا لەسەر عەرزەکە وەستابوو و دەستی دەهێنا بە پێڵاوی خلیسکێنەکەی سیسیلیادا کە هێندە نەبوو بەدیاری دابوویانێ. دواتر وتی؛
_ پێڵاوی چاکن... تاخورکەکەشت باشە!
ئاوڕێکی لە سیسیلیا دایەوە، ئینجا دیسانەوە جوانی 'ئاریل'ی بینیەوە. لەچاو کەڕەتی پێشودا کە بینی، چاوەکانی کەمێک ڕونتر بوون، سەوزتر و پڕنهێنی تر دەهاتنە بەرچاو. بەلای سیسیلیاوە چاوەکانی هەر لە مرواریەکی تایبەتی دەچوون، ئەو لەوەوبەر وێنەیەکی زۆر جوانی ئەو مرواریەی لە کتێبی بەردە بەنرخەکاندا بینیبوو. دڵنیا نەبوو، بەڵام لەو دانەیەیان دەچوو کە ناوی یاقوتی ئەستێرەیی بوو.
سیسیلیا پرسی؛
_ بە چیدا زانیت دایکم بەرەو ئەم ژورە دێت؟

ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "دایکم بەرەو ئەم ژورە دێت"، "بە چیدا زانیت دایکم بەرەو ئەم ژورە دێت؟"
_ لاسایم دەکەیتەوە!
_ دەمەوێت هەروا ڕابمێنم و تامی وشەکان بکەم.
_ ڕابمێنیت و *تامی* وشەکان بکەیت؟
سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ لەڕاستیدا ئەوە تەنها شتە کە فریشتەکان دەتوانن تامی بکەن.
_ دەی باشە.. خۆشبوو؟
_ کەمێک سەیریش بوو.
_ بۆ؟
_ تۆ هیچ بەلاتەوە سەیر نیە کە کاتی خۆی لەناو سکی دایکتدا بویت و لەوێدا جوڵاویتەتەوە؟
سیسیلیا وەک ئەوەی نیشانی بدات کەسێکی بەسەبرە، هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەوەی وەبیرهاتەوە کە بابەتی لەدایک بوونی منداڵ لە هەموو شتێک زیاتر فریشتەکان لە ئاسمان دوردەخەنەوە. سیسیلیا وتی؛
_ تۆ لە کوێوە زانیت کە دایکم بەرەو ئێرە دێت؟
_ دایکت کاتژمێرەکەی خستبووە سەر سێ.
_ ناشێ لە دیواریشەوە شت ببینیت؟
ئاریل هەنگاوێک لە سیسیلیا هاتە پێشەوە و وتی؛
_ بەڕاستی هەقە لە ئێستا بەدواوە ئیتر واز لەو قسە قۆڕانە بهێنیت. ئەو شتەی کە تۆ پێی دەڵێیت "دیوار" لەلای ئێمە دیوار نیە.
سیسیلیا دەستێکی خستە سەردەمی و وتی؛
_ کەواتە چاوی تۆ دیوی ناوەوەی هەموو شتێک دەبینێت. دەتوانیت ناو لەشی من ببینیت؟
_ ئەگەر بمەوێت دەتوانم. بەڵام من نازانم ئێوە هەست بە چی دەکەن کە خواردنێک دەخۆن و لە گەدەتاندا هەزمیدەکەن، دواتریش دەبێتە گۆشت و خوێن.

سیسیلیا موچورکەیەکی پێدا هات و وتی؛
_ پێمخۆشە باسی شتێکی تر بکەین.
_ بۆ نا.
_ دەتوانیت کەمێک بێیتە پێشترەوە؟
چرکەی دوای ئەوە لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەی سیسیلیاوە دانیشتبوو. هەروا هاتە بەرچاوی کە بەبێ ئەوەی بەسەر عەرزەکەدا بڕوات، شوێنەکەی خۆی بگۆڕێت. هەردەتوت وێنەیەکی 'سلاید'ە و لەو کاتەدا کە پەنجەی پێدا دەنێیت لە ئاسماندا بجوڵێتەوە.
سیسیلیا وتی؛
_ من نەمبینی کە بجوڵێیتەوە. لە پڕێکدا لەسەر کورسیەکە دانیشتیت و تەواو.
_ ئێمە وەک ئێوە پێویستمان بەوە نیە کە "بجوڵێینەوە". بە ئارەزوی خۆت شوێنێکم پێ بڵێ کە بۆی بڕۆم و یەکسەر لەوێدا ئامادەدەبم.
_ بەیارمەتیت کەمێک زیاترم دەربارەی ئەوە بۆ ڕونبکەرەوە. ئەوەشم پێ بڵێ بزانم ئێوە چۆن دەتوانن بەدەرگای داخراودا بڕۆن، من بەڕاستی لەوە تێناگەم.
ئاریل کەمێک بیریکردەوە و قسەکەی هەڵسەنگاند، ئینجا وتی؛
_ پێت دەڵێم، بەڵام بە مەرجێک.
سیسیلیا سەریسوڕما؛
_ نەمزانیبوو کە فریشتەکان بەرامبەر بە ئیشە باشەکانیان مەرج دادەنێن!
_ ئاخر تۆ داوای ئیشێکی باشم لێناکەیت، بەڵکو تۆ داوام لێدەکەیت کە چەند نهێنیەکی ئاسمانیت لا بدرکێنم.
_ باشە مەرجەکەت چیە؟
_ مەرجەکەم ئەوەیە کە تۆ باسی نهێنیە زەمینیەکانم بۆ بکەیت.
_ ئاە.. تۆ خۆت هەمووی دەزانیت، ئیتر من چیت پێ بڵێم.
ئاریل لەسەر کورسیەکە خۆی بردە پێشەوە و وتی؛
_ من نازانم چ هەستێکت دەبێت ئەگەر جەستەیەکت لە گۆشت و خوێن هەبێت. نازانم گەورەبوون چیە. نازانم هەست بەچی دەکەیت

کە خواردنێک دەخۆیت، یان کە سەرمات دەبێت، یان کە خەونێکی خۆش دەبینیت.. من ئەوانە نازانم.

_ دڵنیام کە من یەکەم کەس نیم کە تۆ قسەی لەگەڵدا دەکەیت، تۆ خۆت نەتگوت 'ئێمە لەسەرەتای سەرەتاوە هەر لێرەدا بوین؟'.

_ بەڵام من هێندەشم وت کە فریشتەکان هەمیشە سەرسامن بەرامبەر مەخلوقەکان و قەتیش دەست لەو سەرسامبوونەیان هەڵناگرن. بەدەر لەوەش ئێمەی فریشتە هێندە زووزوو خۆمان دەرناخەین. دواجار کە وەک فریشتەیەک پاسەوان بووم زیاد لە سەدساڵێک لەوەوبەربوو، ئەو کاتە لە ئەڵمانیادابووم.

_ ئەی ئەو کەرەتە بۆ لای کێ چوویت؟

_ لەلای 'ئەلبێرت' ناوێک بووم، زۆر نەخۆشبوو.

_ دواتر چی بەسەرهات؟

_ بەداخەوە باش نەبوو، هەر لەبەرئەوەش بوو کە منی لەلا بووم.

سیسیلیا موچورکەیەکی پێداهات.

_ خۆ تەنها لەو کاتانەدا نایەنە میوانی کە شتێکی خراپ ڕوودەدات. ئەمە بێماناترین شتە کە لە ژیانمدا گوێم لێبووبێت.

_ قەت ئەوە شتێکی بێمانا نیە کە دڵنەوایی کەسێکی دڵتەنگ بدەیتەوە.

_ ئەو باسی ئەوەی بۆ نەکردیت کە مرۆڤ چۆن چۆنیە؟

ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند و وتی؛

_ تەمەنی هێندە کەمبوو کە نەیدەتوانی باسی ئەو شتانە بکات.

_ بەداخەوە..

_ بۆ؟

_ کەواتە دەبێت من خۆم هەموو شتێکت بۆ باسبکەم.

_ بەڵام بە ڕێکەوتنەکەمان ڕازیت؟

سیسیلیا ویستی کەمێک لە جێگاکەی بەرزبێتەوە. دواتر وتی؛

_ هەوڵدەدەم، بەڵام دەبێت تۆ لە پێشدا دەستپێبکەیت.

_ باشە.. کەواتە ڕێک کەوتین!

ئاریل بەباشی بۆی دانیشت. دوو قاچە ڕوتەکەی لە کراسە سپیەکەیەوە هاتبوونە دەرەوە. هەردووکیانی خستە سەر جێگای خەوەکەی سیسیلیا. قاچەکانی هەروەک قاچی منداڵی کۆرپە ساف و لوسبوون. سیسیلیا تەنانەت یەک کونی بچکۆلەی لەسەر پێستەکەی بەدینەدەکرد.

بەرلەوەی ئاریل بناسێت، قەت لەوەوپێش خەیاڵی بۆ ئەوە نەچووبوو کە موی لەش پەیوەندی بە ئاژەڵ و ڕووەکەوە هەبێت. لەویادا هێندەشی بۆ رونبووەوە کە چەندە سەیروسەمەرە دەبوو ئەگەر قاچی فریشتە موی پێوەبوایە. چەندەها شت لەسەر درەختی پیر دەڕوێت. لەسەر مرۆڤ و ئاژەڵیش هەروەها. تەنانەت لەسەر بەردیش قەوزە دەڕوێت، بەڵام هیچ شتێک لەسەر پێستی فریشتە ناڕوێت.

سەرنجی چووە سەر نینۆکەکانی قاچی. بە ئاشکرا دیاربوون کە قەت پێویستیان بە بڕین نەبووە. نینۆکەکانیشی یەکێک لە بەردە بەدەگمەنەکانی دەچوو. دڵنیا نەبوو، بەڵام هەر لەو دانەیەدەچوو کە پێیان دەگوت 'کریستاڵی شاخ'.

_ قەت فریشتە هیلاک دەبێت؟

_ بۆچی بیر لەوە دەکەیتەوە؟

_ چونکە قاچت خستە سەر جێگای خەوەکەم.

خەندەیەکی مەکراوی گرتی و وتی؛

_ لەو کاتانەدا مرۆڤم بینیوە کە لەلای یەکتری دادەنیشن و دەیانەوێت پێکەوە دووبەدوو کاتێک بەرنەسەر.

_ کەواتە دیسانەوە لاسایی دەکەیتەوە. بۆچی تۆ ناتوانیت خۆت خۆت بیت؟ دایکم زۆرجار دەڵێت "تکایە شەرم مەکە".

_ دەکەواتە با منیش داوات لێبکەم لەسەر جێگاکەت بەرزبیتەوە، چونکە پاش ماوەیەک خۆش نیە قسە لەگەڵ کەسێکدا بکەیت کە بەردەوام پاڵکەوتبێت و تەپاوتلبکات.

_ ئاخر من هەر *زۆرزۆر* نەخۆشم.

_ هەستە خۆت ڕاست بکەرەوە سیسیلیا.

هەوڵی دا بەقسەی فریشتەکە بکات و پاش نەختێک پێی هەردووکیان بەرامبەری یەکتری بوو، سیسیلیا لەسەر جێگاکەیەوە و ئاریلیش لەسەر کورسیەکەوە. دوای ئەوە سیسیلیا هەستیدەکرد باشترێک بێت. دەمێکبوو ئاوها بە قنجی دانەنیشتبوو. بیری لەوە دەکردەوە چ نهێنیەکی تایبەت بە ژیانی سەر زەوی بۆ فریشتەکە باسبکات.

ئاریل دەستی بەقسەکرد و وتی؛

_ زۆربەی خەڵکی وا دەزانن فریشتە تارماییەکە و بەبێ ئەوەی لەشێکی ڕاستەقینەی هەبێت لە نێوان ئاسمان و زەویدا دێت و دەچێت..

_ من خۆم ڕێک بەو شێوەیە مەزەنەی فریشتەم کردبوو.

_ بەڵام ڕێک بە پێچەوانەوەیە. ئێوە بەلای ئێمەوە شتێکی سوک و فشەڵن. کاتێک کە تۆ شەقێک لە بەردێک دەدەیت، قاچت دەیکێشێت بە بەردەکەدا. بەڵام ئەگەر من هەمان شت بکەم، شەق لەناو هەموو بەردەکە دەدەم. بەلای منەوە بەردەکە لە تۆپەڵێک تەم ڕەقترێک نیە.

_ ئێستا لەوە تێدەگەم کە بە چ شێوەیەک بە دەرگا و دیواردا دەڕۆن و هیچیشتان لێنایەت. بەڵام لەوە تێناگەم کە ئێوە بەدیوارەکاندا دەڕۆن، چۆن ناڕوخێن؟

_ تۆش کە بە ناو تەمێکدا دەڕۆیت، تەمەکە هیچی لێنایەت. کاتێکیش کە بیردەکەیتەوە، بیرکردنەوەکانت ناتوانن هیچ زیانێک بە چواردەورەکەت بگەێنن.

_ لەوانەیە وابێت. بەڵام ئەگەر بتوانیت بەناو دیوارێکدا بڕۆیت، کەواتە دەبێت لەشێکی ڕاستەقینەت نەبێت.

_ دەستێک لە قاچمەوەبدە سیسیلیا.

سیسیلیا دوو پەنجەی لە پەنجە گەورەی قاچی فریشتەکەوە ئاڵاند و چڕنوقی لێگرت، بەڵام هەر دەتوت دەست لە پۆڵا دەدات.

ئاریل وتی؛

_ لەشی ئێمە لە لەشی هەموو مەخلوقاتەکانی تر چڕترە. فریشتەکان قەت هیچیان لێنایەت و نافەوتێن. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە

ئێمە لەشێکمان نیە لە خوێن و گۆشت پێکهاتبێت و ڕۆح لێی جودا ببێتەوە.
_ ئەوە شتێکە کە دەبێت دڵت پێی خۆش بێت..
_ بەڵام لە سروشتدا بەو شێوەیە نیە. لێرەدا هەموو شتێک بە ئاسانی وردوخاش دەبێت. تەنانەت چیاش نەختەنەختە بەهۆی هێزی سروشتەوە دادەخورێت و لەدواجاردا دەبێت بە زەوی و لم.
_ سوپاست دەکەم کە ئەو زانیاریانەم پێدەڵێیت، بەڵام لەڕاستیدا خۆشم ئەوانە باش دەزانم.
_ سیسیلیا، ئێوە وەک تارماییەک وان بەلای ئێمەوە، نەک بە پێچەوانەوە. ئێوە دێن و دەڕۆن. ئێوەن کە بۆ هەتاهەتایە نامێننەوە. لەناکاوێکدا دەردەکەون و هەموو کەرەتێک کە منداڵێک دەخرێتە سکی دایکیەوە وەک شتێکی سەرسوڕهێنەر دەبینرێت، بەڵام هەربەهەمان شێوەش لە پڕێکدا دیارنامێنن. هەر دەڵێیت خوا لەگەڵ ئێوەدا فوو بە بڵقی سابونێکدا دەکات.
سیسیلیا کەمێک چاوی نوقاند و وتی؛
_ ببورە ئاوها ڕاستەوخۆ دەیڵێم، بەڵام قسکەت کەمێک بۆسووی شتێکی سوتاوی لێدێت.
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ شتێکی بێمانات نەگوت. هەموو ئەو شتانەی کە لە سروشتدا بوونیان هەیە، هەر لە شتێک دەچێت کە هێواش هێواش بسوتێت. لەوەدەچێت هەموو ئەو شتانەی بوونیان هەیە لە تێکەڵەیەکدابن و هێدی هێدی بسوتێن.
_ من پێم وانیە شتێکی خۆشبێت کە لە تێکەڵەیەکدا بیت و لەسەرخۆ بسوتێیت. حەزم لەو بیرۆکەیەش نیە کە بە 'تارمایی' ناوزەدم بکات.
ئاریل دەستێکی بەدەمیەوە گرت، وەک ئەوەی لە پڕێکدا هەستیکردبێت کە زۆری گوتووە. لەبەرئەوە بە پەلە وتی؛
_ بەڵام ئێوە بەلای یەکتریەوە وەک تارمایی نین. ئەوەنیە باوکت هەموو جارێک کە بەباوەش دەتباتە قاتی خوارەوە توند هەڵتدەگرێت و ماسولکەکانی گرژدەکات؟

_ وایە.. وایە.. قسەی بێمانا.
_ بۆ وا دەڵێیت؟
_ تۆ بەردەوام ئاوها زۆرزانانە وەڵامی هەموو پرسیارێکم دەدەیتەوە، بەڵام تا ئێستا بەڵگەیەکت نەخستۆتە بەردەستم کە ڕاستی قسەکانتم بۆ بسەلمێنێت.
_ کەواتە دەستمان پێکردەوە و چوینەوە هەمان شوێنی پێشوو!
_ چوینەوە کوێ؟
_ تۆ هێشتا وا دەزانی من درۆت لەگەڵدا دەکەم.
سیسیلیا واخۆی نیشاندا کە گوێ لە قسەکانی نەبێت؛
_ دەتوانیت هەر بۆ نمونە بە دیوارەکەدا بڕۆیتە ژورەکەی دایک و باوکم و بزانیت خەوتوون یان نا؟
_ پێویست ناکات هێندە زۆر ئەو جۆرە یاریانەی جەژن بکەین..
_ هەر تەنها یەک کەڕەتیش ناتوانیت؟
ئاریل لەسەر کورسیەکە هەستا و بە هێواشی بەسەر زەویەکەدا ڕۆیشت. کە گەیشتیشە لای دیوارەکە، لەسەر ڕۆیشتنەکەی هەر بەردەوامبوو. سیسیلیا بەچاوی خۆی بینی کە بەناو دیوارەکەدا خزایە ئەو دیوەوە. دواتریش تەنها یەک قاچی لەمدیوەوە مابوەوە و ئەویشی بەناودیوارەکەدا بردە ئەویوەوە و ونبوو. پاش چەند چرکەیەکیش پێچەوانەکەی بینی. ئاریل بەهێواشی لە دیوارەکەوە هاتەدەرەوە و لەناوەڕاستی ژورەکەدا وەستا. ئینجا وتی؛
_ هەردووکیان خەوتوون. باوکت دەستێکی خستۆتە سەرشانی دایکت. کاتژمێرەکەشیان خستۆتە سەر حەوت.
سیسیلیا بەدەنگێکی بەرز وتی؛
_ ئافەرم!
ئینجا چەپڵەیەکی بۆ لێدا و لەسەر قسەکەی بەردەوامبوو؛
_ کەواتە هیچ پێویست ناکات لە ژورەکەی دایک و باوکم پاڵبکەوم.
_ نەخێر، ئەگەر شتێک ڕوبدات، لە پێش هەموو سەعاتێکەوە من خەبەریان دەکەمەوە.
_ بەڕاست؟

بەبێزاریەوە خەندەیەک گرتی. بێگومان هەر لەبەرئەوەبوو کە سیسیلیا باوەڕی بەو قسەیەش نەدەکرد. ئاریل وتی؛
_ هەموو کەرەتێک بینینی ئەو حاڵەتەم بەلاوە خۆشە. ئەوان وا دەزانن هەر لە خۆیانەوە خەبەریان دەبێتەوە. ئەو کاتانەش دەڵێن "بەڕاست سەیر نیە کە لە خۆمەوە ئا ئێستا خەبەرم بووەوە. خۆم 'هەر زانیم' شتێک بووە".
_ بەڵێ بینینی ئەوە شتێکی خۆشە.
_ خۆشیشە کە گەورەکان بە خەوتووی ببینی. زۆرجار هەر لە منداڵ دەچن. ڕەنگە لە خەویاندا لە بەفرەکەی دەرەوەدا یاری بکەن.
سیسیلیا زەوقی کرایەوە؛
_ شتێکی باشت بە خەیاڵدا هێنام! دەتوانیت بە هێواشی بڕۆیتە خوارەوە و تۆپەڵێک بەفرم بۆ بهێنیت؟ خۆ تۆ پێویستت بە دەرگاکردنەوە و ئەو شتانە نیە.
ئاریل دەمێکبوو لەسەر کورسیەکەی هەستابووە سەرپێ. وتی؛
_ هەر ئەوەندەم لەسەرە دەستم بەناو پەنجەرەکەدا درێژبکەمە دەرەوە. ئێ خۆ بەفرێکی زۆر لەسەر قەراغی پەنجەرەکە کەڵەکە بووە.
هەر واشی کرد. خۆی هەڵدایە سەر مێزی نوسینەکە، سیسیلیا هێندەی بینی کە دەستێکی بەناو پەنجەرە داخراوەکەدا بردە دیوی ئەودیوەوە. چرکەی دوای ئەوە لەناو ژورەکەدا بەپێوە وەستابوو و تۆپەڵێک بەفری بچکۆلەی بەدەستەوە بوو. پەنجەرەکەش هەرووەک پێشوو، هیچ شکاویەکی پێوە دیارنەبوو.
سیسیلیا هەردوو چاوی داپچڕی؛
_ هەر زۆر نایابە!
_ دڵت ئاوی خواردەوە؟
_ بەتەواوەتی نا. حەزدەکەم دەست لە بەفرەکەوە بدەم.
ئاریل لەو کاتەدا کە تۆپەڵە بەفرەکەی هەڵدایە سەر جێگاکەی سیسیلیا وتی؛
_ فەرموو.

ئەویش تۆپەڵە بەفرەکەی خستە ناو دەستیەوە و وتی؛
_ چەند ساردە.. ئەمە یەکەمین جارە دەست لە بەفری ئەم ساڵ بدەم.
ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛
_ 'بەفری ئەمساڵ'.. وەک ئەوە وایە بڵێیت 'میوەی نۆبەرەی ئەم وەرزە' یان 'شتێکی هەر زۆر بەتام'.
سیسیلیا تۆپەڵە بەفرەکەی خستبووە سەر ڕومەتی. لەو کاتەشدا کە دڵۆپەی کرد و خەریک بوو بتوێتەوە، خزانیە ناو پەرداخەکەی سەر تەپڵەکی تەنیشت جێگاکەی. ئاریل دیسانەوە لەسەر کورسیەکەی دانیشتەوە. بەدەنگێکی کەمێک ڕەنجاوەوە وتی؛
_ من خۆم قەت هەستم بە بەفر نەکردووە. ئەوەندەش دەزانم بۆ هەتاهەتایە ناتوانم هەستی پێبکەم.
_ ئەمەیان قسەیەکی بێمانابوو. ئێ کەمێک لەوەوپێش دەستت لێدا.
_ ئاخر هەستم بە هیچ نەکرد.. سیسیلیا، فریشتەکان هەست بە هیچ ناکەن.
_ هەستت بەوە نەکرد کە ساردە؟
بێزاریەک کەوتە سەر دەموچاوی ئاریل و وتی؛
_ ئیتر کاتی ئەوە هاتووە تێبگەیت سیسیلیا، ئەگەر نا، ئەوا بەڕاستی قسەکردن لەگەڵ تۆدا هێندە خۆش نابێت. دەستلێدانی تۆپەڵە بەفرێک بەلای ئێمەوە وەک ئەوە وایە دەست لە بیرکردنەوەیەک بدەین. تۆش ناتوانیت هەست بەیادوەریەکانی بەفرەکەی پار بکەیت.
سیسیلیا سەرێکی ڕاوەشاند و ئاریل پرسی؛
_ هەست بە چی دەکەیت کە تۆپەڵە بەفرێکت لە دەستدا دەبێت؟
_ ساردە... زۆرساردە.
_ لەوەوپێش ئەوەت گوت.
سیسیلیا ناچاربوو تا لەتوانایدایە بیربکاتەوە، ئینجا وتی؛
_ وەک دەرزی دەچێت بە پێستدا. وەک نەعنای کێوی ختوکەت دەدات. حەزدەکەیت دەستت ڕابکێشیتەوە دواوە و بیلەرزێنیت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر زۆر خۆشە.

ئاریل خۆی چەماندبووەوە و زۆر بە پەرۆشەوە تەماشای سیسیلیای دەکرد و گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو، دواتر وتی؛
_ من قەت نەعنای کێویم تام نەکردووە، هەرگیزیش هەڵنەلەرزیووم.
تەنها لەوێدا سیسیلیا بۆی ڕونبووەوە کە ئاریل هەروا بە ئاسانی ناتوانێت لە بابەتە زەمینییەکان تێبگات، وە خۆی ئاسانتر لە بابەتە ئاسمانیەکان تێدەگەیشت. سیسیلیا وتی؛
_ هەڵبەتە ناخۆشە دەست لە شتێکەوە بدەیت و هەستی پێنەکەیت. لەو بارەیەوە هەرە خراپترین شت کە من بیزانم بەنجکردنی دکتۆری دانە.
ئاریل دوبارە لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "بەنجکردنی دکتۆری دان".
_ بەلام بێگومان بەنجکردنی گشتی هەر زۆر خراپترە. ئەو کاتە ناتوانن هەست بەوە بکەن کە دەژین.
سیمایەکی پڕ لە نهێنی کەوتە سەر دەموچاوی ئاریل، ئینجا پرسی؛
_ تۆ لە هەموو لەشتدا هەست بەوە دەکەیت.
سیسیلیا پێکەنی؛
_ لە قژمدا نا. لە نینۆکەکانیشمدا نا.
_ بەلام لەو شوێنانەدا هەست دەکەیت کە پێستی پێوەیەوە و ئەوەش تارادەیەک هەموو لەشی داپۆشیووە. گۆشت و خوێن خراوەتە ناو پۆشاکێکی ئەفسوناویەوە و لەو ڕێگەیەوە هەست بە شتەکانی چواردەورتان دەکەن. تۆ لەوە تێدەگەیت کە خولقاندنی شتێکی لەو بابەتە بە چ شێوەیەک ڕێی تێدەچێت؟
_ پۆشاکێکی ئەفسوناوی؟
_ پێستی تۆ سیسیلیا، مەبەستم لەو ماسکە شانەییە نایابەی دەمارەکانە. ئەو کاتەی خودا ژیانی خولقاند، بەشێوەیەکی هێندە زیرەکانە دروستی کرد کە مەخلوقەکان بتوانن هەست بە خۆیان بکەن. خۆ تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە شتێکی نایابی خولقاندووە؟
_ لەوانەیە..
_ باشە ئێوە ڕێک لە هەموو شوێنێکی لەشدا وەک یەک هەستیارن؟

سیسیلیا ناچاربوو بیرێک لە پرسیارەکەی بکاتەوە، پاشان وتی؛
_ هەموو شوێنی لەشم وەک یەک ختوکەم نادات. لە هەندێ شوێندا پێمخۆشترێکە ختوکەم بدەن. جارجارێکیش هێندە خۆشە کە خەریکە ئێشی بێت. تۆ ئەوە دەزانیت کە ڕێیتێدەچێت شتێک هێندە خۆشبێت کە لە خۆشیدا ئازارت بدات؟
_ "تۆ ئەوە دەزانیت کە ڕێیتێدەچێت شتێک هێندە خۆشبێت کە لە خۆشیدا ئازارت بدات؟"
_ دیسانەوە لاساییم دەکەیتەوە.
ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛
_ نا، من هەوڵدەدەم لە قسەکانت تێبگەم. باشە ڕێیتێدەچێت شتێک هێندە ئازارت بدات کە خۆش بێت بەلاتەوە؟
_ نەء..
_ ببورە کە ئەو پرسیارەم لێکردیت. بەڵام بەڕاستی فریشتەکان نازانن ئێش و ئازار چیە.
_ بەڕاستی ئێوە هەروەک زەوی و بەرد بێهەستن؟
ئاریل بەڕێزەوە سەرێکی بۆ لەقاند و وتی؛
_ بەلایەنی کەمەوە وەک ئەوانەین، بەڵێ!
_ نازانم کامیانم بەلاوە باشترێکە.
_ کە بەرد بیت یان فریشتە؟
_ مەبەستم لەوەیە ئەگەر هیچ هەستێکم نەبوایە، ئەو کاتە قەت هەستم بە ئازاریش نەدەکرد. ڕەنگە باشترین شت ئەوە بێت کە بەتەواوەتی بەنج بکرێیت.
_ کەواتە وابزانم تۆ زیاترێک سەرسامی دکتۆری دانەکەیت، نەک بەنجێکی دیاریکراو کە تەنها شوێنێک دەگرێتەوە.
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند.
_ بەڵام بەبروای من جێی سەرنجە کە فریشتەکانی ئاسمان جیاوازی نێوان باشە و خراپە نازانن.
سیسیلیا دیسانەوە خەریکبوو بڵێت نازانم بڕوام بە فریشتە هەیە یان نا، بەڵام لە پڕێکدا شتێکی بە خەیاڵداهات و وتی؛

_ ئەریَ تۆ بۆچی باڵت نیە؟
ئاریل پێکەنی؛
_ "باڵی فریشتە" خورافاتێکی کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە خەڵکی وایاندەزانی زەوی وەک شلکێنەیەک تەختە و فریشتەکان بەردەوام لە نێوان زەوی و ئاسماندا دەفڕن و دەنیشنەوە. هەر زۆر بە ئاسانی ئەو خورافاتە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە.
_ ئەی خۆی چۆنە؟
_ باڵندە پێویستی بە باڵە بۆ ئەوەی خۆی بەرزبکاتەوە، چونکە لە گۆشت و خوێن دروستبووە. ئێمە لە ڕۆح دروستبووین، لەبەرئەوە پێویستمان بە باڵ نیە بۆ ئەوەی لە جیهاندا بجوڵێینەوە.
سیسیلیا خەندەیەک گرتی؛
_ تائەندازەیەک هەروەکو بیرکردنەوەکانم وایە، ئەوانیش پێویستیان بە باڵ نیە بۆ ئەوەی بە هەموو جیهاندا بفڕن.
هێشتا قسەکانی تەواونەکردبوو کە ئاریل لەسەر کورسیەکەیەوە بەرزبووەوە، هەروەکو میزەڵدانێکی پڕ لە گاز بە ژورەکەدا دەخولایەوە. سیسیلیاش بە چاوی دوای کەوتبوو، دواتر بە دەنگێکی بەرز وتی؛
_ زۆر جوانە! ئەوەت بەلاوە خۆش نیە؟
ئاریل دوبارە لەبەردەمی کتێبخانەکەدا خۆی کێشایەوە بە عەرزەکەدا؛
_ هەست بە هیچ ناکەم.
_ بێگومان دەبێت ئەوە هەستێکی سەیربێت. هەستێکی سەیرە کە هەست بە هیچ ناکەیت.
_ بەڵام بیرکردنەوەکانی تۆش ناتوانن هەست بەو شتە بکەن کە بیری لێدەکەیتەوە، بەهەمان ئەو شێوەیە نیە کە دەست لە تۆپەڵە بەفرێک دەدەیت.
ئاریل پێڵاوە نوێکانی سیسیلیای بەرزکردەوە و لەبەردەمیدا ڕایگرتن؛
_ بەلاتەوە خۆش نیە بەم پێڵاوانەوە خلیسکێنەی سەر بەفر بکەیت؟
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند.

_ ماوەیەکی تر تاقیان دەکەمەوە..
_ کەواتە ئەو کاتە شتێکی 'سارد' ئەزموندەکەیت، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتانەدا کە دەکەونە ناو بەفرەکەوە. لەو کاتانەدا تامێکی نەعنای کێوی تیژ هەموو لەشتان ناتەنێت؟
_ ئەگەر جلی باشمان لەبەردا بێت، هەست بەوە ناکەین. ئەو کاتە هەست دەکەین بەفرەکە هەروەک لۆکە نەرمە. هەندێ جاریش پێڵاوی خلیسکێنەکانمان دادەکەنین و لەبەفرەکەدا فریشتە دروست دەکەین[1].
زۆر خۆشە!
ئاریل پێڵاوەکانی خستەوە شوێنی خۆی و وتی؛
_ ئێمەش زۆر دڵمان بەوە دەکرێتەوە. بەدەرلەوەش نیشانەی خزمایەتی منداڵانی مرۆڤ و منداڵانی خودا لە ئاسماندا دەردەخات.
_ بەڕاستی ئەوە نیشاندەدات؟
زۆر بە جدی سەری بۆ لەقاند؛
_ یەکەم شت لەبەرئەوەیە کە ئێوە فریشتە دروستدەکەن. خۆ دەکرا شتێکی تر دروستبکەن. دووهەم شتیش لەبەرئەوەیە کە لەو کاتانەدا زۆر خۆش ڕادەبوێرن. هەموو فریشتەکان پێیان خۆشە شتی خۆش بکەن.
_ تۆ پێت وا نیە گەورەکانیش پێیان خۆشبێت شتی خۆش بکەن؟
ئاریل شانێکی بۆ هەڵتەکاند؛
_ تۆ قەت کەسێکی گەورەت بینیوە لەکاتی خلیسکێنەدا پێڵاوەکانی دابکەنێت و خۆی بدات بە بەفرەکەدا بۆ ئەوەی فریشتە دروستبکات؟
سیسیلیا سەری بۆ لەقاند؛
_ کەرەتێکیان نەنکم ڕێک ئەو شتەی کرد کە تۆ باسی دەکەیت.
_ بزانە!

---

[1] منداڵان لەناو بەفردا لەسەر گازی پشت پاڵدەکەون و هەتا بتوانن قاچ و دەستیان بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە دەبەن و دەهێننەوە، دواتریش کە هەڵدەسن جێشوێنێک لەسەر بەفرەکە دروستدەبێت و بەوە دەڵێن وێنەی فریشتە، لەڕاستیشدا هەر لە وێنەی فریشتە دەچێت و

_ چی؟
_ دیارە کە نەنکت پەیوەندی لەگەڵ منداڵەکەی ناوەوەیدا لەدەست نەداوە.
ئاریل دیسانەوە بەژورەکەدا بەرزبوەوە و دەخولایەوە، کە لەسەر کورسیەکەی بەردەم جێگاکەی سیسیلیا نیشتەوە وتی؛
_ پێم ناخۆشە ئەم قسەیە بکەم، بەڵام کەمێک خاو دەڕوات.
_ مەبەستت لە چیە؟
ئاریل لە بێزاریدا هەناسەیەکی هەڵکێشا.
_ ئا ئەمە پێکگەیشتنێکی زۆر بەدەگمەنی نێوان ئاسمان و زەویە. وا بڕیاربوو کۆمەڵێک نهێنی ئاسمانیت پێبڵێم ئەگەر تۆ باسی ژیانی لەشی پڕ خوێن و گۆشتم بۆ بکەیت.
سیسیلیا هەستیدەکرد هیلاک و ماندووە، چونکە بەبڕوای ئەو 'ئاریل'ی فریشتە شتەکانی دوبارە دەکردەوە. دواتر وتی؛
_ ئاخر کەمێک پێم ناخۆشە کە هەر لێرەدا ئاوها پاڵبکەوم.
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ تا ئێستاکە بەلای فریشتەیەکی وەک منیشەوە پاسەوانیەکەم هێندە خۆش نیە.
_ بڕۆینە خوارەوە؟ خۆ من هەر لەو کاتەدا لەوێ بووم کە دیاریەکانیان دابەشکرد..
ئاریل دوبارە لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "بڕۆینە خوارەوە؟"، من ئەوەم پێخۆشە، خۆ هێشتا هەر شەوی جەژنە.
_ بەڕاستی پێت وایە بتوانیت یارمەتیم بدەیت و بڕۆینە خوارەوە؟
_ بێگومان.
_ دەتوانیت هەڵمبگریت؟
_ سیسیلیا، ئێوە بەلای ئێمەوە کێشتان هەر نیە.
_ دە کەواتە تا قاتی خوارەوە هەڵمبگرە.

***

ئاریل دەستێکی بەهێزی خستە ژێر سیسیلیا و لەسەر جێگاکەی بەرزیکردەوە. سیسیلیا هەستیدەکرد ئەم جارەیان زۆر جیاوازتربێت لەو جارانەی کە باوکی بەباوەش هەڵیدەگرت. ئەو هەموو جارێک

هەناسەبڕکێی تێدەکەوت، هەر دەتوت باوبۆرانە. بەڵام لەسەر قۆڵی فریشتەکە سیسیلیا هەستیدەکرد کێشی هەر هێندەی کێشی پەڕێک سوکە، هەرچەندە ئاریل لە خۆی زۆر بچکۆلەتریش بوو.
بەهێواشی هاتنە ڕاڕەوەکەوە و بە پلیکانەکاندا هاتنە خوارەوە بۆ ژوری دانیشتنەکەی خوارەوە. لەوێدا چیتر باپیرەی لە دالانەکەدا نەوەستابوو سیگار بکێشێت. بەڵام ئەگەر لەوێدا بوایە، بڵێیت ئەو کاتە بیتوانیبایە ئاریل ببینێت؟ یان ئەو کاتە پێی وادەبوو سیسیلیا بەئاسمانەوە دەخولێتەوە؟
ژوری دانیشتنەکە نیمچە تاریکێکی تەواوبوو. تەنها گڵۆپی سەر کورسیە سەوزەکە داگیرسابوو. سیسیلیا وتی؛
_ هەموو جارێک ئەوان لەسەر قەنەفەکە دامدەنێن.
ئاریل بە هێواشی لەسەر قەنەفە سورەکە داینا و سیسیلیا سەیرێکی سەرەوەی کرد و وتی؛
_ گڵۆپەکانی سەر دار سنەوبەرەکەیان کوژاندۆتەوە. چەندە دڵڕەقن!
چرکەی دوای ئەوە ئاریل پلاکەکەی کرد بە کارەباکەدا. ئینجا چووە بەردەم دارەکە و دەستی بۆ بادا. گڵۆپەکانی سەر دار سنەوبەرەکە هەموو ژورەکەی پڕکرد لە جەوی جەژنی لەدایکبوونی مەسیح.
سیسیلیا وتی؛
_ هەر زۆر خێرا بوویت. هەر لە ڕۆحیانەتی ناو فانۆسەکە دەچیت کە هەموو داوایەک دەهێنێتە دی... دەبینی دارەکە چەندە جوانە؟
ئاریل بە ڕێزەوە سەری لەقاند؛
_ هەر لە گڵۆپەکانی ئاسمان دەچن.
_ بەڕاستی وایە؟ بۆیە دەپرسم، چونکە من زۆرجار بیرم لەوە کردۆتەوە. ئەرێ لەوێش لۆکە دەکەن بە گڵۆپەکانەوە؟
ئاریل کەوتە ڕونکردنەوە و وتی؛
_ گڵۆپەکانی ئاسمان بریتین لە هەموو هەسارە و ئەستێرەکان. کۆمەڵێک گاز چواردەوری هەندێ لە ئەستێرەکانی گرتووە. تۆ پێت وانیە هەر لەبەر ئەوەشبێت کە ئێوە لۆکە دەکەن بە گڵۆپەکانی سەر دار سنەوبەری جەژنی لەدایکبوونەوە؟

_ من قەت لەوەوپێش بیرم لەوە نەکردۆتەوە. بەڵام هەموو جەژنێک باسی ئەوە دەکەین کە لۆکە بکەین بەدارەکەوە یان نا. دایکم حەزی لێ نیە، نەنکیشم هەروەها، بەڵام ئەمساڵ نەیانوێرا بەرەنگاری قسەکەی من ببنەوە.

_ هەر هیچ نەبێت ئەستێرەیەکتان کردووە بە سەری دارەکەوە.

سیسیلیا تەماشایەکی سەرەوەی کرد؛

_ ئەو ئەستێرەیەی کە لەوەوپێش داماندەنا، لە پرێکدا دیارنەما و لێمان ونبوو. بەڕاست.. ئەم دانەیەیان کەمێک خوار داناوە..

چرکەی دوای ئەوە ئاریل لەئاسمانی ژورەکەدا بەدەوری ترۆپکی دار سنەوبەرەکەدا دەخولایەوە. سیسیلیاش چاوی داپچڕیبوو. هەندێ وەرەقەی شێوە فریشتەییان بە دارەکەوە هەڵواسیبوو، ڕەنگی هەندێکیان سپیبوون و هەندێکی تریشیان ئاڵتونی. بەڵام لەوێدا فریشتەیەکی ڕاستەقینە بەدەوری دارەکەدا دەخولایەوە!

_ ئەی ئێستا ڕێک وەستاوە؟

_ وابزانم.. بەڵام هەروا زوو مەیەرەوە خوارەوە. زۆر جوانە ئاوها دەتبینم بەئاسماندا دەخولێیتەوە.

ئاریل بەرزبووەوە بۆ ژێر سەقفەکە و مەترێک لەسەرو مێزی نانخواردنەکەوە پاڵکەوت و لەبۆشایی ژورەکەدا لارەلاری دەکرد.

سیسیلیا وتی؛

_ خۆزگە بمتوانیبایە بفرم. وابزانم ئەو کاتە لە هەموو شتێک هەڵدەهاتم.

ئاریل دەستی بۆ خوارەوە ڕاکێشا و ئاماژەی بۆ قاپێکی گەورە کرد کە کێک و چکلێتی تێدابوو.

_ قاپی کێکەکەیان لا نەبردووە.

_ نەء، فەرموو دەستت ڕاکێشە.

ئاریل ڕێک بەدەوری قاپەکەدا خولایەوە و وتی؛

_ خۆشدەبوو ئەگەر بۆم هەبوایە.

_ بێگومان بۆت هەیە. هەر مەپرسە چەندە کێکیان دروستکردووە.

ئاریل هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛

_ من وتم فریشتەکان ناتوانن هیچ بخۆن. ئێمە *ناتوانین* نان بخۆین.
_ ئۆوو.. ئەوەم لەیادنەبوو.
_ کاتەکان دێن و دەڕۆن، نەوەش دەبێت بەدوای نەوەدا بێت. بەو شێوەیەش بەردەوام مێزی نوێ دەڕازێنرێنەوە و خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆری لەسەردادەنێن. بەڵام فریشتەکانی ئاسمان قەت نازانن تامی ئەو خواردنانەی سەر زەوی چۆنە.
_ دەتوانیت پارچەیەک کێکم بدەیتێ؟
_ ئاریل هاتە خوارەوە و پارچەیەک کێکی هەڵگرت. بە ئاسمانی ژورەکەدا فڕی و دایە دەستی سیسیلیا. ئەویش بە گازی بچوک بچوک کەوتە خواردنی. ئاریل بەڕاکشاوی لەئاسماندا بەسەر قەنەفەکەی سیسیلیادا مایەوە. ئەوجا وتی؛
_ بەلامەوە شتێکی هەزەلیە کە دەتانبینم نان دەخۆن.
_ بۆ؟
_ ئێوە شتێک دەخەنە دەمتانەوە و ماوەیەک دەیجون و ملْچەی بۆدەکەن، دواتریش تامی شتێک دەدات و ئینجا دەبێتە گۆشت و خوێن.
_ وایە، بەو شێوەیەیە.
_ چەند جۆر تامی جیاواز هەیە؟
_ نازانم. پێم وانیە کەتەلۆکێکی پڕاوپڕی هەموو تامەکان هەبێت.
_ باشە خۆشترین تام بەلای تۆوە چیە؟
سیسیلیا بەباشی بیریکردەوە و ئینجا لەوەڵامدا وتی؛
_ وابزانم.. شلیک.. ئاسکریمێک کە شلیکی تێدابێت.
ئاریل چاوی زەقکردەوە و وتی؛
_ زۆر بەلامەوە سەیرە کە تۆپەڵێک شتی ساردی بەتامی نەعنا دەخەنە ناو دەمتانەوە. بێگومان ئەو کاتە هەڵدەلەرزن و ناوسکتان ختوکەی دێت، وایە؟
_ تۆ زۆر بەشێوەیەکی نهێنی دەرتبڕی. بەڵام ئەوەیان ڕاستە کە هەندێ جار ختوکەی ناو سک دەدات. زۆر خۆشە!

ئاریل بەردەوام هەر بەسەر قەنەفەکەوە بوو. تاوناتاوێک دە بۆ بیست سانتیمەترێک دوردەکەوتەوە و جارجارێکیش کەمێک لە سیسیلیا نزیک دەبووەوە. دواتر ئاماژەی بۆ مێزی نانخواردنەکە کرد و وتی؛

_ لەوێدا هەندێک شلیک لەناو قاپێکدایە.

سیسیلیا پێکەنی؛

_ ئەوە چکلێتی شلیکە و هی 'لاس'ە.

_ تامەکەی زۆر جیاوازترە لە تامی شلیک؟

_ بەڵێ، هەر زۆر جیاوازە. بەڵام گەر کەتەلۆکی تامە خۆشەکان هەبوایە، ئەوا هەردوکیانی تێدا دادەنرا.

سیسیلیا تەماشای چاوە یاقوتیە تیژەکانی 'ئاریل'ی کرد.

ئاریل لێی پرسی؛

_ دەتوانیت وەسفی جیاوازی نێوان شلیکی ئاسایی و چکلێتی شلیکم بۆ بکەیت؟

سیسیلیا هێشتا هەر کێکەکەی دەجوو. سەیرێکی قاپی سەر مێزەکەی کرد کە چکلێتەکانی تێدابوو، ئینجا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی؛

_ شلیکی باخەکە تامێکی ترش و شیرینی هەیە، بێگومان تامی شتێکی سوریش دەدات. وە ئەگەر چکلێتێکی شلیک بخۆیت، ئەوساش هەر تامی شتێکی سوردەدات، چونکە ڕەنگی سوری میوەیان تێکردووە، بەڵام بەر لە هەموو شتێک تامێکی خۆشی وشک و شیرینی حەڵوا دەدات.

_ 'تامێکی خۆشی وشک و شیرینی حەڵوا..'

_ تۆ دەزانیت ئەو حەڵوایە لە بادەم دروستدەکەن؟ لەبەر ئەوەیە کە دەڵێم تامێکی وشکی شیرین، چونکە وەک دەزانیت هاڕاوەی بادەم وشکە و شیرینیەکەش هی ئەوەیە کە شەکری تێدەکەن.

هەندێ وردە کێک بەدەستیەوە مابوونەوە و سیسیلیا لێیسایەوە؛

_ بەڕاستی ئا ئێستاکە دڵم بۆ هیچ یەکێک لەو دوانە لێنادات، چونکە نەخۆشم. بەڵام لەبەرئەوەی ڕۆژی جەژنە، پێم وابێت هەر هیچ نەبێت ئاساییە بیریان لێبکەمەوە.

ئاریل لە بێزاریدا سەری ڕاوەشاند؛
_ هیچ سودیکم لەو وەسفکردنەت وەرنەگرت. تام و ئەو جۆرە شتانە بەلای فریشتەکانی ئاسمانەوە هەتا بڵێیت نهێنیەکی گەورەیە.
_ بەڵام خۆ بەلای خوداوە وا نیە، خۆ ئەو خۆی ئێمەی خوڵقاندووە.
ئاریل نیشتەوە و لەسەر قاچی سیسیلیا دانیشت. کێشی نەبوو. لەو کاتەدا کە بەر قاچی کەوت، سیسیلیا هەستی بە هیچ نەکرد، تەنانەت ختوکەشی نەهات. ئینجا ئاریل وتی؛
_ هەمیشە بەتەواوەتی لەو شتانە تێناگەین کە دەیانخوڵقێنین.
_ بۆ نا؟
_ بۆ نمونە دەتوانیت هێڵکاریەک یان وێنەیەک لەسەر پارچە کاغەزێک بکێشیت، بەڵام ئیدی ئەوە مانای ئەوە نیە کەبتوانیت خۆت بخەیتە شوێنی ئەو شتەی کە کێشاوتە و بزانیت هەست بەچی دەکات.
_ ئێ ئەوە شتێکی تەواو جیاوازە، چونکە ئەو شتانە زیندوو نین.
زۆر بەگوڕ سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ شتە سەیرەکەش ڕێک لەو خاڵەدایە.
_ لە چیدا؟
_ لەوەدایە کە ئێوە زیندوون.
_ سیسیلیا سەری هەڵبڕی و تەماشای سەقفەکەی دەکرد؛
_ بەلایەنی کەمەوە لەوەیاندا ڕاستدەکەیت کە خودا لەوە تێناگات کە چەندە بێمانایە لە ئێوارەی ڕۆژی جەژنی لەدایکبووندا نەخۆش بیت..
ئاریل قسەکانی پێبڕی؛
_ دواتر دەتوانین زیاترێک باسی خودا بکەین. بەڵام تۆ لەپێشدا پێم بڵێ بزانم ژیانی مرۆڤ چۆنە، ژیانێک لە لەش و خوێن پێکهاتبێت، بە چ شێوەیەکە؟
_ کەواتە پرسیاربکە! دەتوانیت پرسیار دەربارەی هەموو شتێک بکەیت.
_ لەووپێش باسی تامکردنمان کرد. بەڵام توانای بۆنکردنی ئێوە هەروەک تامکردن سەیر و پڕنهێنیە، سەیرە کە ئێوە دەتوانن بەبێ

ئەوەی لوتتان لە شتەکانەوە نزیک بێت، بۆنی ئەو هەموو شتە جیاوازانە بکەن. ئەو 'بۆن'انە چین کە دونیایان پڕکردۆتەوە؟
_ ئەترسم نەتوانیت بۆنی دار سنەوبەرەکەش بکەیت؟ یان چی؟
ئاریل لە بێزاریدا هەناسەیەکی هەڵکێشا؛
_ سیسیلیا، فریشتەکان هەستیان نیە. ئێ خۆ ئائێستا لە تاقیکردنەوەی ئایندا نین، بەڵام بەڕاستی ئیتر هەقی خۆیەتی کە لەوە تێبگەیت.
_ ببورە.
_ بۆنی دارەکە چۆنە؟
_ بۆنی سەوزیی لێدێت.. بۆنێکی ترشباو و بۆنی هەوای پاکی دەرەوەی لێدێت.. کەمێکیش سارد و شێدارە. بەڵام بۆنی شتێکی شیرینیشی لێدێت. بەلای منەوە بۆنی دار سنەوبەری جەژن نزیکەی نیوەی جەوی جەژنەکەیە. دواتریش بۆنی کەلەرمی ترش و بغورد لە پلەی دووهەم و سێهەمدا دێن. لەپلەی چوارەمیشدا بۆنی سیگارەکەی باپیرەم دێت، بەڵام جارجارێکیش چەندەها بۆنی خۆش خۆشی تریش دێت.
_ بۆنی گڵۆپەکانی سەر دارەکەش دەکەن؟
_ نەخێر.. پێم وانیە.
_ مەبەستت لەوەیە کە خۆشت نازانیت بۆنی دێت یان نا؟
_ پاش ئەوەی دارەکە دەڕازێنینەوە و گڵۆپەکان دادەگیرسێنین، دارەکە بۆنێکی تری لێدێت. مەبەستم لەوەیە کەمێک جیاوازە، بەڵام ئەو کەمە بچکۆلەیە کاریگەریەکی گەورەی لەسەر جەوی جەژنەکە هەیە.
_ باشە. پێم وانیە دەربارەی 'بۆن'ەکانیش هەروەک 'تام'ەکان، بتوانین لەوەندە زیاترێک قوڵببینەوە. بەڵام ئایا ژمارەیەکی بێشومار بۆنی جیاوازیشتان نیە؟
_ لەوانەیە، بەڵام من پێم وانیە مرۆڤ خاوەنی ئەندامێکی بۆنکردنی باشبێت. ڕەنگە ژمارەی ئەو 'بۆن'انەی کە دەتوانین جیایان بکەینەوە لە سەد دانە تێنەپەڕێت، بەڵام دەتوانین هەزار تامی جیاواز بکەین. سەگ ئەندامێکی بۆنکردنی باشتری هەیە. وابزانم دەتوانن چەند

هەزار بۆنێکی جیاواز جودابکەنەوە. ئەوەش شتێکی هێندە سەیر نیە، چونکە لایەک لە دەموچاوی سەگ لە لوتێکی گەورە پێکهاتووە.
_ بەڕاستی شێوەی باسکردنەکەت هێندە خراپ نیە. دەتوانی باسی بینینیشم بۆ بکەیت.. بینین چۆنە؟
_ وابزانم تۆش هەروەک من شتەکان دەبینیت، وایە؟
ئاریل لە قەنەفەکەوە بەرزبووەوە، بەئاسمانی ژورەکەدا فڕی و لەسەر کورسیە سەوزەکە نیشتەوە. لەچاو کورسیەکەدا هەر زۆر بچکۆلەبوو، هەر دەتوت غەرقی کورسیەکە بووە. وتی؛
_ بەڵام من شتەکان بەهەمان شێوە نابینم. جگەلەوەش من لە زەوی و ئاو کۆنەکراومەتەوە. من پارچەیەک هەویری ئەفسانەیی زیندوونیم.
_ ئەی باشە کەواتە تۆ چۆن شتەکان دەبینیت؟
_ دەتوانیت ناوی بنێیت دەماری ڕۆحانی.
_ بەڵام خۆ تۆ من دەبینیت؟
سەری بۆ ڕاوەشاند؛
_ من هەر ئەوەندەیە کە لێرەدام و تەواو.
_ منیش لێرەدام. بەڵام خۆ بەردەوام دەتوانین یەکتری ببینین، وا نیە؟
ئاریل کەمێک زیاتر ڕونیکردەوە و وتی؛
_ باشە تۆ لە خەونتدا شت دەبینیت؟
_ زۆرکەڕەت لە خەونمدا بەڕوونی شتەکان دەبینم.
_ بەڵام خۆ لەو کاتانەدا بە چاوەکانت شتەکان نابینیت؟
_ نەخێر، چونکە لەکاتی خەودا چاوەکانم نوقاون.
_ کەواتە لەوانەیە هێندە تێبگەیت کە چەند جۆرێکی بینین هەیە. هەندێ خەڵک کوێرن، لەبەرئەوە دەبێت چاوی ناوەوەیان بەکاربهێنن. ئەوەش هەر هەمان ئەو چاوانەیە کە تۆ لەکاتی خەوندا خەوە شیرینەکانی پێدەبینیت.
_ "چاوەکانی ناوەوە؟"
ئاریل سەرێکی لەقاند؛

_ چاوێکی تەواو جیاوازە و لەو چاوانە ناچێت کە پێڵوەکانی دادەخەیت و لەرێگەی هاوێنە زیندوەکانیەوە سروشتی دەوروبەرتی پێدەبینیت. کاتێک کە پیازێک پاک دەکەیت یان کاتێک کە تەپ و تۆز دەچێتە چاوتەوە، شێوەی بینینەکەت دەشێوێنێت. لە خراپترین حاڵەتیشدا بەتەواوەتی بینین لەدەست دەدەیت. بەڵام هیچ شتێک ناتوانێت زەرەر بە چاوەکانی ناوەوە بگەیێنێت.

_ بۆ نا؟

_ چونکە لە گۆشت و خوێن پێک نەهاتوون.

_ ئەی لە چی پێکهاتوون؟

_ لەیادوەری و ئەندێشە.

_ ئەو باسە کەمێک ناخۆش و ترسناکە.

ئاریل هەردوو دەستی لەسەر دەسکی ئەملاولای کورسیەکە دانا و بەو شێوەیەش لەچاو کورسیەکەدا هەر زۆرزۆر بچکۆلەتر دەهاتە بەرچاو. ئینجا وتی؛

_ بەلای منەوە ئەوەیان زۆر زیاتر ناخۆشتر و ترسناکترە کە دوو چاوی زیندووت پێوەبێت کە لە مۆلیکیول و ئەتۆم پێکهاتبێت و هەموو چواردەورەکەتی پێببینیت. جگەلەوەش دەتوانن تەماشای گەردوونی پێبکەن و هەندێک لە شتە قەشەنگە ئاسمانیەکانی پێببینن. بەڵام ئەو شتەی کە ئێوە شتەکانی پێدەبینن، لە دوو تۆپەڵ شوشە دەچێت و لەرادەبەدەر لە چاوی ماسی دەچێت.

_ کە بەم شێوەیە باسی دەکەیت، زۆر پڕ نهێنی دێتە بەرچاوم.

ئاریل دەستی بەشێوەیەک ڕاوەشاند کە قسەکەی بەرپەرچبداتەوە و وتی؛

_ لەوە زیاتر پڕنهێنی نابێت کە هەیە. چەندەها ملیۆن ساڵ لەمەوبەر تاکوتەرای ماسیەکانی ناو دەریاکان لەبری باڵە کورتەکانیان دوو قاچیان بۆ دروستبوو تا پێی بڕۆن. بەو شێوەیە گیانەوەرە وشکاوەکیەکان بە گاگۆڵکێ هاتنە سەر زەوی، بەسەریدا خولانەوە و بەدوای خواردندا دەگەڕان. ئێستاکەش هەر بەهەمان ئەو چاوە دەتوانن لەدوری هەزاران ساڵی تیشکی شتێکی گەردوون ببینن،

هەمان ئەو چاوەیە کە کاتی خۆی جگە لە ئەستێرەی دەریا و ژیژکی دەریا هیچی تری نەدەبینی. لەوەش زیاتر؛ ئێستاکە دەتوانن لەسەر قەنەفەیەکی سور ڕاکشێن و ڕاستەوڕاست تەماشای ناو چاوی فریشتەیەکی خودا بکەن.

سیسیلیا پێکەنی؛

_ منیش لەو بڕوایەدام ئەوە شتێکی سەیرە.

_ ئەگەر خوا چاوی نەخوڵقاندبایە، ئەو کاتە نەیدەویست ئەم گەردونەتان لەگەڵدا بەشبکات. ئەو کاتە باخچەی عەدەن تا ئێستاش هەر لە ڕەشاییەکی قەترانیدا دەمایەوە.

سیسیلیا لەدوایەوە وتیەوە؛

_ 'ڕەشاییەکی قەترانی'.. هەر زۆر غەمگینانە دێتە بەرگوێ.

ئاریل لەسەر قسەکانی بەردەوامبوو و وتی؛

_ هەموو چاوێک گۆشەیەکی بچکۆلەی نهێنی خوایانەیە. بینین ڕێک ئەو شوێنەیە کە شتەکان و بیرکردنەوە تێیدا بەیەک دەگەن، بینین ئەو دەروازە پڕبەهایەی نێوان خۆر و هزرە. چاوی مرۆڤ ئەو ئاوێنەیەیە کە تێیدا پانتایی خوڵقێنەری ناو ئاگایی خودا، ڕوبەڕوی پانتایی شتە خوڵقێنراوەکانی دەرەوەی دەبێتەوە.

سیسیلیا دەستێکی بەرزکردەوە و قسەکانی پێبڕی؛

_ وابزانم لەو ڕستەیەی دواترت تێنەگەیشتم.

'ئاریل'ی فریشتەش کەوتە ڕونکردنەوە و وتی؛

_ هەندێ لە فریشتەکانی ئاسمان پێیان وایە هەموو چاوێک کە ئیشەکانی خودا دەبینێت، چاوی خودا خۆی بێت. چونکە کێ دەڵێت خودا چەندەها ملیارد چاوی نیە؟ ڕەنگە بە ملیارد یەکەی بینینی بچکۆلەی بەسەر ئافەریدەکانیدا پرژاندبێت، تەنها بۆ ئەوەی هەمیشە بتوانێت لە چەندین ملیارد گۆشەی جیاوازەوە ئیشەکانی خۆی ببینێت. ئێ خۆ مرۆڤ ناتوانێت چەند سەد مەترێک بەمەلە بچێتە ناو قوڵایی دەریاکانەوە، لەبەرئەوە چاوی بە ماسیەکانیش بەخشیوە. وەک دەشزانین مرۆڤ توانای فڕینی نیە، بەڵام هەمیشە چاوی

زیندووی پۆلێک باڵندە لە ئاسمانەوە تەماشای سەر زەوی دەکەن. بەڵام ئەمەش هەموو شتێک نیە..

_ کەواتە زیاترێک باسبکە!

_ جارجارێک مرۆڤ چاوی بەرز دەکاتەوە و تەماشای سەرچاوە ئاسمانیەکەی دەکات. ئا لێرەدایە کە لەوە دەچێت خودا خۆی لە ئاوێنەیەکدا ببینێت.

سیسیلیا هەناسەبڕکێی پێکەوت.

_ ئاسمان و دەریا!

_ بەڵێ، وەک ئاسمان و دەریا.

_ چۆن؟

_ ئاسمان خۆی لە دەریادا دەبینێتەوە. بەهەمان شێوەش خودا دەتوانێت خۆی لە چاوی چەند مرۆڤێکدا ببینێتەوە. چونکە چاو ئاوێنەی ڕۆحە و خوداش دەتوانێت خۆی لە ڕۆحی مرۆڤدا ببینێتەوە.

سیسیلیا هەر زۆر سەرسامبوو؛

_ دەبوایە تۆ قەشە بوویتایە، هەڵبەتە ئەگەر ئەم بیروڕایانەت دژی باوەڕی باوی ئاینی نەبێت.

خەندەیەکی زۆرزانانە کەوتە سەر لێوی ئاریل؛

_ ئێمە لە ئاسماندا هێندە زۆر گرنگی بەو شتانە نادەین. ئێمە هەمیشە ئەوەمان زانیوە کە ئافەراندن مەتەڵێکی گەورەیە و کە شتێکیش مەتەڵ بێت، دەبێت هێندە ڕێگا بدەیت کە کەمێک هەڵیبهێنن.

سیسیلیا هەردوو شانی کوڕکردەوە؛

_ لەو کاتانەدا کە تۆ ئاوها بە جدیانە خۆت دەردەخەیت، ئارەقێکی سارد بە پشتمدا دێتە خوارەوە. خۆ لەوانەشە بەهۆی 'تاکەمەوە بێت... زیاترێک باسی هەستەکان نەکەین؟

_ تەنها دوو دانەمان ماوە. تۆ حەزت لە مۆسیقا و گۆرانیە؟

_ لە کاتی ئێستادا حەزم لە گۆرانیەکانی جەژنی لەدایکبوونی 'سیسیل کیارکەبیو'یە. پێش ئەوەی تۆ ببینم، هەمیشە وام هەستدەکرد کە ئەو فریشتەبێت. بەڵام ئێستاکە وا تێگەیشتم کە 'قژە

فریشتەییەکەی' ئەویش لە مەیمونەکانەوە هاتووە. بەڕاست، هەندێک خەڵک دەڵێن کە شێوەی من لەو دەچێت.

_ ئاوها.

_ تۆ دەڵێیت چی؟

_ شێوە لێکچوونێکتان تێدا دەبینم.

_ تۆ ئەوت بینیوە؟

_ تاڕادەیەک ناکرێت کەسێکی وا نەبینیت.

_ باشە ئێستاکە باسی چ هەستێک دەکەین؟

ئاریل پێکەنی؛

_ بەڕاستی قسەکردن لەگەڵ تۆدا خۆشە سیسیلیا! من بۆیە وتم 'تۆ حەزت لە مۆسیقایە' بۆ ئەوەی باسی بیستنم بۆ بکەیت. چونکە فریشتەکانی ئاسمان بەهیچ جۆرێک لەوە تێناگەن کە لەش و خوێن ئەو توانایەیان هەبێت.

_ شتێکی هێندە سەیرە؟

_ تۆ ئەوە وەک نهێنیەکی بچکۆلە نابینیت کە باڵندەکان پڕ بە زاریان دەخوێنن و بەو شێوەیەش لە دوری چەندەها کیلۆمەترەوە دەتوانن گوێیان لەیەکتری بێت؟ ئەو بونەوەرە بچکۆلە توکنانە هەروەک فلوتی پڕلەژیان وان و بەردوام خۆیان خۆیان لێدەدەن. هەروەک ئەوەش شتێکی سەیرە کە هەموو ئەو وشانەی من دەیانڵێم بە تۆ دەگەن.

_ دیسانەوە وا هەست دەکەم زیادەڕۆیی دەکەیت لەوەدا کە دەڵێیت ئێمە و ئێوە هێندە جیاوازین. ئێ خۆ تۆش گوێت لە قسەکانی منە.

ئاریل هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا؛

_ دە با ڕاست و ڕەوان پێتی بڵێم؛ ئەگەر یەک کەڕەتی تر ئێمە و ئێوە وەک یەک دابنێیت، یەکسەر دەچم سەردانی نەخۆشێکی تر دەکەم. لەڕادەبەدەر خەڵکی هەن کە هەرگیز فریشتەکان سەردانیان ناکەن.

سیسیلیا بەپەلە قسەکەی لەدەم وەرگرت و وتی؛

_ بێگومان مەبەستت لەوەیە کە تۆ وەک من گوێی ڕاستەقینەت نیە، بەڵام لەوەدەچێت ئێمە بیرکردنەوەکان تێکەڵ بکەین و..

_ بەڵێ شتێک لەو بابەتە. بەڕاستی بمبوورە کە وتم دەچمە لای نەخۆشێکی تر. خەتای تۆ نیە کە وردەوردە لە شتەکان تێدەگەیت. تۆ هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکدا دەبینیت، تۆ هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینیت.

_ 'لە ئاوێنەیەکدا، لە نهێنیەکدا..'.

_ ئینجا تۆ لاساییم دەکەیتەوە.

_ دەمەوێت هەروا لە وشەکان ڕابمێنم و تامیان بکەم!

دواتر ئاریل وتی؛

_ کاتی خۆی زەوی وشک و بەتاڵ بوو، پاشانیش ئەو توانایەی پێبەخشرا کە گوێی لە دەنگی خۆی بێت. بەدرێژایی چەندەها میلۆن ساڵ هەورەبروسکە و هەورەگرمەی بوو، دەریاکەشی خۆی دەکێشا بە بەردی کەنارەکەدا، بورکانەکانیش بەرد و کانزای تواوەی خۆیان بەو پەڕی هێزوتوانایەوە فڕێدەدایە دەرەوە. بەڵام کەس گوێی لە هیچ شتێک نەبوو. ئەمڕۆکە ئەم گۆی زەویە دەتوانێت گوێی لە دەنگی خۆی بێت. ئەستێرەی ڤینۆس یان مەریخ ئەو توانایەیان نیە. خۆ ئەگەر هەر زۆر بێدەنگیش بێت، ئەوا دەتوانیت کۆنسێرتێکی ئۆرگۆنی 'جۆهان سبەستیان باخ'ی بخەیتە سەر. من خۆم زیاترێک ئەو کۆنسێرتە گەورانەم بەدڵە کە لەدەرەوەی هۆڵەکاندا و لەهەوای پاکدا سازدەکرێن. لەو کاتانەدا هەرە خۆشترین دەنگی ئەم زەویە بە ئاسماندا پەرش و بڵاودەبێتەوە. کۆنسێرتەکانی ڕادیۆشم بەلاوە خۆشە. گۆی زەوی خۆی بۆ خۆی ئاوازدەژەنێت. قتویەکی مۆسیقی بچکۆلەی ئەم زەویە، بەچواردەوری خۆرێکی ئاگرینی ڕێگای کاکێشاندا دەخولێتەوە.

وەک پێشنیارێک سیسیلیا وتی؛

_ هەقە شاعیر بویتایە، بەڵام شاعیرێکی کەمێک مۆدێرن.

_ گەر لەدەست خۆمدا بووایە، ئەوا حەزمدەکرد ببمە تویژەرەوەی سروشتی، چونکە بەتەواوەتی نازانم چ شتێک ڕوودەدات کاتێک کە ئێوەی مرۆڤ پێکەوە قسەدەکەن. وشە نەبینراوەکان لە دەمی کەسێکەوە بەهێواشی دێنە دەرەوە و پاشان خۆیان دەخننە ناو

گوێچکەیەکی بچکۆلەی کەسێکی ترەوە و دواتریش لەناو مێشکتاندا دەتوێتەوە، ئەو مێشکەی کە هەر لە تۆپەڵە 'جەلی'یەک دەچێت.
کتومت ئالەوێدا ئەو شتە ڕوویدا کە فریشتەکە وەسفیدەکرد. وتە سەیروسەمەرەکانی ئەو لە مێشکی سیسیلیادا توانەوە و بوونە بەشێک لە بیرکردنەوەی. سیسیلیا بۆ ماوەیەکی زۆر هەر پاڵکەوتبوو و بیری لەوە دەکردەوە، دواتر ئاریل دەستیکردەوە بە قسەکردن؛
_ هەر بەهەمان شێوەش ئێوە بەجۆرێکی زۆر سەرسوڕهێنەر وشەکان لە دەمتاندا دادەڕێژن. هەندێ جار هێندە بەپەلەپەل قسەدەکەن، هەر دەڵێیت وشەکان خۆیان بۆ خۆیان دێنە دەرەوە. باشە قەت ئەوە ڕوونادات کە پاش ئەوەی شتێک دەڵێن، ئینجا خۆتان بزانن کە چیتان وتووە؟
سیسیلیا تەماشای خوارەوەی دەکرد؛
_ ئێمە هەمیشە بیر لە سەرتاپای ئەو شتانە ناکەینەوە کە دەیانکەین. بۆ نمونە کە ناچاربم بەپەلە خۆم بگەێنمە قوتابخانە، ڕادەکەم و تەواو. کاتی ئەوەم نیە بیر لەوە بکەمەوە بە چ شێوەیەک قاچەکانم بجوڵێنمەوە. گەر وا بکەم ئەوا بەدڵنیاییەوە لە شتێک هەڵدەکەوم. هەمان شتیشە کاتێک پێکەوە قسەدەین. هەندێجار لە پەرۆشیدا بەشێوەیەکی ناڕوون وشەکان دەردەبڕین.
_ هەمیشەش دەبێ هەناسە هەڵبمژن... و بیدەنەوە. ئەوەش هەر خۆی لە خۆیەوە ڕوودەدات؟
_ وابزانم.
_ کەمێک گوماناوی دێتە بەرگوێ. چونکە ئەگەر ئێوە تەنها یەک کەڕەت لەبیرتان بچێت هەناسەبدەن، دڵتان لەلێدان دەکەوێت. کە دڵیش لە لێدان کەوت..
سیسیلیا قسەکەی پێبڕی و وتی؛
_ لێرەدا بوەستە! خۆشبەختانە پێویست ناکات ئێمە بیر لە هەموو شتێک بکەینەوە.
ئاریل دەستێکی خستە سەر دەمی خۆی؛

_ ببورە! باسی ئەوەمان دەکرد کە ئێوە بە چ شێوەیەک ئەو وشە نادیارانە لەدەمتاندا دادەڕێژن و دواتر لەدەمەوە بەشەپۆل دەچنە ناو گوێچکەتانەوە. ڕاستە دەڵێن هەر کەسە و جۆرە دەنگێکی جیاوازی پێوەیە؟

سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند؛

_ دایکم بەجۆرێکی تایبەتی پێم دەڵێت "باش خەوتیت؟" و شێوەی وتنەکەی ئەو هەر زۆر زۆر جیاوازترە لەو شێوەیەی کە باوکم یان نەنکم هەمان ڕستەم پێدەڵێن. هەر بۆ نموونە من دەتوانم سەرم بخەمە ژێر سەرینەکەمەوە و ڕاستودروست بزانم چ کەسێک قسەم لەگەڵدا دەکات. هەر کەسەو وشەکان بەشێوەیەکی کەمێک جیاواز دەڵێت. لەم بارەیەوە پێمخۆشە بڵێم دەنگی ئامێرە مۆسیقیەکانیش هەمان شێوەیە. بۆ نموونە ئامێری کلارنێت و کەمانچە بە دوو شێوەی تەواو جیاواز تۆنی 'سی' لێدەدەن. بەڕاست.. لەشوێنێکدا خوێندمەوە کە هیچ دوو کەمانچەیەک لە دونیادا نیە کە هەمان لەرەیان هەبێت. دەنگی ئێمەی مرۆڤیش هەمان شتە.

_ لێرەوە شێوازی ورد و نایابی هەردوو ئامێری دەنگ و گوێچەمان بۆ دەردەکەوێت.

_ تەنانەت لەو کاتانەدا کە پەنجەرەکەش داخراوە، دەتوانم گوێم لە ڕەشەبای دەرەوە ببێت... یان دەزانم کە پۆستەچیەکە بەخۆی و پاسکیلەکەیەوە دێت. خۆزگە لەو کاتەدا دەتبینی کە پاسکیلەکەی ژێری خزا..

_ ئەو کاتە منیش لەسەر پەنجەرەکە دانیشتبووم و وەک تۆ تەماشام دەکرد.

_ وابزانم تۆ لە هەموو شوێنێکدایت... هەندێ جار کە ماڵەکە تەواو خامۆشە، گوێم لە دەنگی بەفرە کە دەبارێت.

سیسیلیا وردەوردە لەکاتی قسەکانیدا دەستێکی ڕادەوەشاند؛

_ بەو شێوەیەش دەتوانم بە گوێچکەکانم شت ببینم.

_ قسەی بێمانا!

'ئاریل'ی فریشتە دەموچاوی گرژکرد و وتی؛

_ ڕاستە باسی شتی سەیروسەمەرە دەکەین، بەڵام پێویست ناکات هەڵم بخڵەتێنیت.
_ بەڵام بەڕاستی هەڵت ناخڵەتێنم و ڕاست دەکەم. کە من لە ژورەکەمدا پاڵکەوتووم و گوێم لە دەنگی قاتی خوارەوە دەبێت، بەشێوەیەک لە شێوەکان ئەوانی تر دەبینم و دەزانم خەریکی چین، دەزانم چ شتێک لە خوارەوە ڕوودەدات.
_ کەواتە کەمێک لە توانای بینینی فریشتەکانت تێدایە.
سیسیلیا لەسەر جێگاکەی قنجبووەوە؛
_ من بەردەوام لەو بڕوایەدابووم کە تۆ زیادەڕۆیی لە جیاوازی نێوان فریشتە و مرۆڤدا دەکەیت.
_ هەتا بشڵێیت جیاوازیەکی سەیرو سەمەرەیە، چونکە ئێوە و ئێمە دوو بنەمای تەواو جیاوازمان هەیە. ئێوە لە تێکەڵی چەند ملیۆن گەردیلەیەک پێکهاتوون و لەسەر هەسارەیەکی ڕێکەوتی ئەم گەردوونەدا دەژین. هەروەها ئێوە تەنها بۆ ساتێکی کەم لێرەدان. بەڵام ئێوە بەهێواشی بەناو بووندا دەسوڕێنەوە. ئێوە کتومت بەهەمان شێوەی فریشتەکان قسەدەکەن و پێدەکەنن و بیرۆکەی فێڵبازانەتان بەخەیاڵدا دێت.
_ تۆ پێت وا نیە فریشتەش بە هەمان شێوە شتێکی پڕ لە نهێنی بێت؟
_ لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد. جیاوازیەکە لەوەدایە کە ئێمە هەمیشە لێرەدابووین. لەسەروئەوەشەوە ئێمە دەزانین کە ئێمە هەرگیز هەروەک بڵقێکی سابون ناکەوینە ناو هیچێتیەکی بەتاڵەوە. سیسیلیا.. ئێمە بوونمان هەیە و تەواو. ئێمە ئەو شتەین کە هەمیشە هەر بوونی هەبووە و بۆ هەتاهەتاشە هەر بوونی دەبێت. بەڵام ئێوە دێن و دەڕۆن..
سیسیلیا بەنارەحەتیەوە سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ زۆرم پێخۆشدەبوو گەر زیاترێک بیرم لە ژیان بکردایەتەوە و بمزانیبایە ژیان چیە.
_ هەرگیز درەنگ نیە کە بگەڕێیتەوە سەر ئەوەی کە بزانیت ژیان چیە.

_ بەڕاستی خۆشم نازانم بۆ، بەڵام لە پڕێکدا زۆر ماندەبم...
ئاریل ویستی لەوێدا بیوەستێنێت؛
_ هیچ پێویست ناکات بێتاقەت بیت! گەر ماتبیت، ئەوا ناچاردەبم بەردەوام دڵنەواییت بدەمەوە. هەندێ جار وادێتە بەرچاوم کە ئێوە تەنها خەریکی کڕوزانەوە و گلەیی کردنن.
_ بۆ تۆ ئاسانە ئاوها بڵێیت!
_ تەنها یەک هەستمان ماوە باسی بکەین. ئەویش کەمێک نادیارە، بەڵام لە ئەوانی تر نهێنی کەمترێک نیە.
سیسیلیا فرمێسکێکی چاوی سڕی؛
_ ناوی هەستی پێنجەمم لەیاد نیە... هەستکردن نیە؟
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند.
_ لەوەوپێش باسی ئەو توێژاڵە تەنکەی پێست و مومان کرد و وتمان سەرتاپای لەشی تێیدا ترنجاوە، هەر لە تەپڵی سەرەوە تا قولە پێ. ئێوە بە زمان تام دەکەن. بەڵام بەشێوەیەک لە شێوەکان بەهەموو لەشیشتان تام دەکەن. تامی شتێکی سارد یان گەرم دەکەن، تەڕ و وشکیش هەروەها، لوس و زبریش..
_ من پێم وا نیە ئەوە شتێکی هێندە سەیر بێت.
_ ڕەنگە بەلای فریشتەوە ئەوە سەیرو سەمەرەترین شت بێت. بەردەکانی قەراغ دەریا کە شەپۆلی ئاوەکە لێیان دەدات، هەست بەوە ناکەن کە بەسەر یەکدا دەخزێن. بەردەکان تەنانەت هەست بەوەش ناکەن کە تۆ دەستیان لێدەدەیت. بەڵام تۆ هەستیان پێدەکەیت.
_ بەڕاست تۆ بەوردی ئەو بەردانەت بینیوە کە من کۆمکردونەتەوە؟ هەندێکیانم کڕیوە، هەندێکیشیان پێبەخشیوم، بەڵام زۆربەی هەرەزۆریم لە قەراغ ئاوێکدا دۆزیوەتەوە. لە "قەراغ ئاوێکی نادیار"دا.
_ لە دورگەی 'کریتا'دا دۆزیتنەوە، وایە؟
سیسیلیا کەمێک هەستیکرد نهێنیەکی ئاشکراکردوە و وتی؛
_ ئەوەش دەزانی؟

ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند.
_ لەو کاتانەدا کە تۆ دەخەوتیت، چەندەها جار تەماشای ئەو بەردانەم کردووە. بەڵام قەت لەوە تێناگەم چ جۆرە هەستێکت دەبێت کە دەستیان لێدەدەیت.
_ کەواتە شتێکی گرنگت لەدەستچووە. هەندێکیان هێندە خڕ و لوسن کە دەستیان لێدەدەم حەزدەکەم پێبکەنم.
ئاریل لەسەر کورسیەکە بەزبووەوە و بە ئاسمانی ژورەکەدا بەرەو سەقفەکە هەڵکشا. لەو کاتەدا کە بە ئاسمانەوە بوو وتی؛
_ کەواتە باسی پێنج هەستەکەمان کرد...
سیسیلیا قسەکەی پێبڕی و وتی؛
_ بەڵام هەستی شەشەمیش هەیە.
_ بەڕاست؟
_ هەندێ خەڵکی پێیان وایە هەستێکی تریان هەبێت و لە ڕێگایەوە بتوانن پەی بەو شتانەبەرن کە بەهەستە ئاساییەکانیان ناتوانن بیانزانن. بۆ نمونە دەتوانن پێشبینی ڕوداوەکانی پاشەڕۆژبکەن. یان شتێکی ونبوو بدۆزنەوە. خەڵکانێکی تریش لەو بڕوایەدان کە ئەوە خورافات بێت و هیچی تر.
ئاریل بەشێوەیەکی پڕلەنهێنی سەرێکی بۆ لەقاند و وتی؛
_ لەوانەیە هەر لە ڕێگەی ئەو هەستەوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەستێرە ونبووەکەی دار سنەوبەرەکە بدۆزینەوە.
_ تۆ دەزانیت لە کوێدایە؟
_ با بزانین..
سیسیلیا هەر پاڵکەوتبوو و بیری لە جەژنی لەدایکبوونی مەسیح دەکردەوە. دواتر وتی؛
_ بیر لە شتێک دەکەمەوە؛ بڵێیت جەوی جەژنی ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح پەیوەندیەکی بەو هەستەوە نەبێت؟ وابزانم ئێمە لەو جەژنەدا، بەبەراوردکرنی لەگەڵ ڕۆژەکانی تری ساڵدا، زیاترێک لە فریشتە دەچین. بەهەرحاڵ ئەو جەژنە پەیوەندی بە هەموو هەستەکانی ترەوە هەیە. من بۆنی جەژن دەکەم، تامی جەژن دەکەم،

دەیبینم و گوێشم لێیە. دواجاریش دەست لە هەموو پاکەتی دیاریەکان دەدەم و دەتوانم شتەکەی ناوەوەیان هەڵبهێنم و بزانم چیان تێدایە.
دەموچاوی ئاریل ڕوناکبووەوە و وتی؛
_ ئاها.. 'چیان تێدایە'.. پێم خۆشە کەمێک باسی ئەوەش بکەین.
_ باسی ئەو شتانەی کە لەناو پاکەتی دیاریەکاندایە؟
_ نەخێر، دەربارەی ئەو شتەی کە لە ناوەوەی تۆدایە.
_ ئۆوو.. ئەوەیان زۆر ناخۆشە.
_ کەمێک بەلامەوە سەیرە.
_ چیت بەلاوە سەیرە؟
_ ئەوەم بەلاوە سەیرە کە ئێوە پێتان وایە باسکردنی ئەو شتەی کە خۆتانی لێ دروستبوون، شتێکی ناخۆشبێت. بۆ نمونە بیر لەوە بکەرەوە ئەگەر بەردێک قبوڵی ئەوەی نەکردبایە کە بەردە. ئەوساکە دەبووە بەردیکی زۆر مات و غەمگین، چونکە ئەو کاتە ناچاردەبوو بۆ ماوەی هەزارەها ساڵ خۆی بەچاوێکی کەمەوە خۆی ببینێ و دەبوایە هەر بە ماتی بمایەتەوە هەتا ئەو کاتەی بەرەبەرە دەتوایەوە و دەبووە زیخ و لم. بەڵام خۆ ئێوە هێندە زۆر نامێننەوە..
_ دەتوانین کەمێک باسی ئەو شتەی ناوەوەشمان بکەین، بەڵام بە مەرجێک.
_ مەرجەکەت چیە؟
_ کە تۆش دواتر باسی چەندەها شتی قەشەنگی ئاسمانیم بۆ بکەیت.
_ فریشتەکان قەت پەیمان ناشکێنن.
_ ڕاستە، بەڵام ئەگەر پەیمان بشکێنن، ئەوا بڕوام بەهیچ شتێک نامێنێت.
_ ڕەنگە تۆ بتوانیت وەڵامی پرسیارێکم بدەیتەوە کە ئێمە بەردەوام لە ئاسماندا تاوتوێی دەکەین و زۆر جاریش تەبانین لەسەری. لەڕاستیدا کەمێک شەرم دەکەم باسی بکەم، بەڵام..
_ بپرسە!
ئاریل دەستیکرد بە قسە؛
_ ئێوە هەست بەوە دەکەن کە خوێن بە دەمارەکانتاندا وروژم دەکات؟

_ تەنها لەو کاتانەدا هەستی پێدەکەین کە بریندار دەبین و خوێنمان لێدەڕوات، یان لەو کاتانەدا کە خوێنمان بۆ تاقیگە لێوەردەگرن. بەڵام لەو کاتانەدا ئیتر خوێنەکە خۆی دێتە دەرەوە...
_ باشە ئەی هەست بە چی دەکەن؟
_ هەندێجار ختوکەی دێت، بەڵام دواتر ئێشی دێت.
_ بەڵام خۆ هەرهیچ نەبێت هەست بەو لەش و خوێنەی ناو خۆتان دەکەن؟
سیسیلیا سەری بۆ ڕاوەشاند.
_ وابزانم ئێمە بە شێوەیەکی ئاوها دروستبووین کە پێویستمان بەوە نەبێت هەست بەو شتانە بکەین کە لە ژێر پێستماندایە. ڕاستە هەر لە ڕێگەی پێستەوە دەتوانین هەست بە یەکتری بکەین، بەڵام خۆشبەختانە ڕزگارمانبووە لەوەی بەردەوام هەست بە ناوەوەی خۆمان بکەین.
_ بەڵام خۆ هەر هیچ نەبێت هەست بە شتێک دەکەن؟
سیسیلیا کەمێک بیریکردەوە و ئەوجا سەری بۆ ڕاوەشاند و وتی؛
_ هەست بەهیچ ناکەین، بەلایەنی کەمەوە لەو کاتانەدا هەست بە هیچ ناکەین کە ساغین. تەنها کە شوێنیکمان ئێشی..
_ ئێشێ؟
_ کە ژان بکات.. یان لێبدات.. یان ئازاری هەبێت.
ئاریل لەناچاریدا دەستی بەملاولادا بادا و وتی؛
_ 'ژان بکات یان لێبدات یان ئازاری هەبێت..'
سیسیلیا وتی؛
_ تۆ قەت چڕنوقت لە قۆڵی خۆت نەگرتووە؟
_ نەخێر، قەت ئەوەم نەکردووە.
_ هەقە ئەوە تاقیبکەیتەوە، ئەگینا قەت بەتەواوەتی لەوە دڵنیا نابیت کە بەخەبەریت یان نا.
ئاریل خەریکبوو چڕنوق لە قۆڵی خۆی بگرێت، بەڵام سیسیلیا دەیبینی کە ناتوانێت بەتەواوەتی دەستی لێی گیربێت. دواتر ئاریل سەری ڕاوەشاند و وتی؛

_ فریشتەکان ناتوانن چرنوق لە قوڵی خۆیان بگرن. ئێمە هەست بەهیچ ناکەین.
سیسیلیا سەریسوڕما؛
_ کەواتە ناتوانیت بزانیت کە بەڕاستی بوونت هەیە یان نا.
بۆ ماوەی چرکەیەک، یان کەمترێک لە چرکەیەک، لەوە دەچوو کە ئاریل ونبووبێت. ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێت کە سیسیلیا چاوی تروکاند.
لەو کاتەدا کە دەرکەوتەوە وتی؛
_ باشترە بەپەلە بتخەینەوە ناو جێگاکەت.
_ بۆ؟
_ کاتژمێر حەوتە. چەند چرکەیەکی کەمی ماوە کە زەنگی کاتژمێرەکە لێبدات.. ئەها ئەوە زەنگ لێدەدات..

***

سیسیلیا خەبەری بووەوە و هەستیدەکرد لەشی قورسە. دەرەوەش ڕوناک و ڕونبوو و هەر لە ڕۆژێکی جەژنی خۆشدەچوو.
تەنها کەمێک لە ڕوداوەکانی شەوی پێشووی لەیادبوو. ئاریل بەباوەش هەڵیگرت و بردیە ژوری دانیشتنەکەی خوارەوە. دواتریش هەر بە باوەش هەڵیگرتەوە و بردیەوە ژورەکەی خۆی، ڕێک لەو کاتەدابوو کە زەنگی کاتژمێرەکەی ژوری نوستنی دایک و باوکی لێیدا.
سیسیلیا بەهێواشی چرپاندی؛
_ ئاریل!
بەڵام هیچ وەڵامێکی دەستگیر نەبوو، ڕەنگە تەنها هەر بە شەو بێت بۆ لای..
زەنگی سەرمێزە بچکۆلەکەی تەنیشت جێگاکەی بەرزکردەوە و زەنگێکی لێدا. دایکی دەمودەست هاتە ژورەکەیەوە، ئەو ماوەیەی کە

دایکی پێیچوو، هەر هێندەی ئەو ماوەیەبوو کە ئاریل پێویستیبوو تا گڵۆپی دار سنەوبەرەکە دابگیرسێنێ. دایکیشی تاڕادەیەک هەروەک ڕۆحیانەتێکی ناو فانۆس وابوو.
_ ئێ.. کەواتە خەبەرت بووەتەوە!
دایکی لەبەردەم جێگاکەیدا لەسەر ئەژنۆ دانیشت.
_ وا سەعات یەکە. هەتا ئێستا هەر خەوتبوویت؟
سیسیلیا سەری بۆ ڕاوەشاند.
_ ئەی خەریکی چی بوویت؟
_ پاڵکەوتبووم و شتم دەبینی و گوێم لە شت بوو. شەوانەش دەنگ لە ماڵەکاندا هەیە، هەڵبەتە ئەگەر گوێچکەمان بەباشی بەکاربهێنین. هەندێ جار گوێم لێیە کە لەدەرەوە بەفر دەبارێت.
_ ئەی تەماشای چیت دەکرد؟
_ ڕوناکیەکی جوان لە پەنجەرەکەوە دێتە ژورەوە..
_ ئێ خۆ دەتتوانی زەنگێکمان بۆ لێبدەیت.
_ پاڵکەوتبووم و بۆ خۆم بیرم لە شتی جیاواز جیاواز دەکردەوە.
_ هیچ شوێنێکت دەیەشا؟
_ نەخێر.. بەهیچ شێوەیەک ئازارم نەبوو.
_ هەستت بەچی دەکرد؟
_ دەستی پێدەکەیتەوە؟
_ بە چی؟
_ نەخێر، هیچم نەبوو. هەر زۆر زۆر لاوازم..
_ بەهەرحاڵ کاتێک سەعات حەوتی بەیانی سەرێکم لێدایت، هەروەک بەردێک بەقوڵی خەوتبوویت.
_ دایە، بەرد ناخەوێت.
_ بەدەم خەوەوە خەندە گرتبوویتی.
_ دایە، بەرد خەندەش ناگرێت.. بەڕاست، کە تۆ هاتیتە ئێرە، هێندە نەبوو خەوم لێکەوتبوو.
_ خۆت لەو بڕوایەدایت؟
_ گوێم لێبوو کە زەنگی سەعاتەکە لێیدا.

دایکی دەستێکی خستە سەر ناوچەوانی سیسیلیا.
_ 'کریستینا' هاتووە. لەخوارەوە دانیشتووە و خەریکی خواردنی چکلێتەکانی 'لاس'ە.
_ نۆشی گیانی بێت.
_ مەبەستت چیە؟
_ بەهیچ شێوەیەک حەزم لە چکلێت نیە. خرف بوویت یان چی؟
_ نەء، ئومێدەوارم خرف نەبووبم.
_ پێی بڵێ با بێتە سەرەوە بۆ لام. خۆ من چیتر لە دەرزی ناترسم.
_ وابزانم واباشترە لە پێشدا دەستێک بە ئاو بگەیێنین.
_ دایە...
_ بەڵێ؟
_ باشە ناکرێت کریستینا ئەو دەرزیەم لێبدات و ببڕێتەوە؟
_ با، دەکریت؟!
_ زۆرجار باسی ئەوە دەکەن کە من چۆنم و شتەکان ناویان چیە و لەو بابەتانە. تاقەتم نیە باسی ئەو شتانە بکەم. جگە لەوەش ئێ ئەمڕۆ یەکەمین ڕۆژی جەژنە ئیتر.
_ ڕەنگە ناچاربێت و کەمێک تەماشات بکات.
_ باشە، بەڵام دەبێت تۆش لێرەبیت. ئەگەریش دەستیکرد بە دڵنەوایی دانەوەم، دەبێت پەیمانم بدەیتێ کە دەریبپەڕێنیتە دەرەوە. ئێ خۆ من لە هەموو بارێکدا نازنم بە چ جۆرێک وەڵامی بدەمەوە.
_ هەوڵدەدەم.
_ شتێکی تریش دایە.. هەر چاک دەبمەوە. پەیمانت دەدەمێ کە چاکدەبمەوە.
_ ڕاستە، چاک دەبیتەوە.
_ بەڵام پێم خۆشە بەس من بڵێم کە چاک دەبمەوە. چونکە کە ئێوە وام پێدەڵێن، وا دەزانم فریوم دەدەن.
_ زۆرزان!
سیسیلیا سەرێکی هەڵبڕی؛
_ چیە.. دەگریت؟

دایکی چاوی سڕی؛

_ نەء..

_ ئێ فرمێسک بە چاوتەوە دەبینم.

_ ئا... کەمێک لەمەوپێش تۆزێک پیازم جنی.

_ دیسانەوە؟

پاش ئەوەی سیسیلیا کۆمەڵێک دەرمانی جۆراوجۆری لێدرا و خواردنیشی خوارد، یەکەیەکەی خێزانەکە بەڕیز سەردانیان کرد. 'لاس' چووبووە دەرەوە و پێڵاوە نوێکانی خلیسکێنەکەی لە لێژاییەکەی تەنیشت ڕوبارەکەوە تاقیکردبووەوە. ڕوبارەکە بەستبووی، تەنانەت گوێی لەوەش نەبووبوو کە ئاو بە ژێر سەهۆڵەکەدا دەڕوات. هەندێ لە منداڵانی پۆلی پێنج و شەش خلیسکێنەیان لە پانتایی ڕوبارەکەدا کردبوو.

باوکی ژمارەیەکی نوێی 'گۆڤاری زانستی' بۆ بردە سەرەوە. لەوەوپێش کۆمەڵێک لەو گۆڤارەی بۆ هێنابوو. یەکەمین جار ئەو ژمارەیەی پێبەخشیبوو کە وتارێکی دەربارەی کانزا و بەردە بەدەگمەنەکانی تێدابوو و ناوی وتارەکە بەم جۆرە بوو؛ 'بۆیە شاخەکان گەنجینەی سەر زەمینن'. هەندێک لە وتارەکانی تریشی خوێندبووە و دواتر داوای کتێب و گۆڤاری زیاتری کردبوو. بەڵام ئەوە ماوەیەکی باشی بەسەردا تێپەڕیوە و ئێستاکە سیسیلیا چیتر تاقەتی ئەوەی نیە چەند لاپەڕەیەکی زۆر بە یەک جار بخوێنێتەوە.

باپیرەی باسی سەفەرەکەی 'کریتا'ی بۆ کرد. لەو سەفەرەدا هەموویان پێکەوە بوون، داپیرە و باپیرەش. ڕێک لەو کاتەدابوو کە زانیان سیسیلیا نەخۆشە. سیسیلیا خۆی ڕاست و دروست ئەوەی لەیاد نەمابوو، نەیدەزانی کەمێک لە پێش ئەو سەفەرەوە بوو کە بۆیدەرکەوت نەخۆشە یان کەمێک لەدوای ئەو سەفەرەوەبوو. بەڵام لە هەموو بارێکدا بردبوویان بۆ لای دکتۆر...

ئەو سەفەرە هەموویان پێکەوە بوون و هەمووان پێیان وابوو کە 'خۆشترین سەفەر'ی ژیانیان بووبێت. چواردە ڕۆژی خۆش بۆ خۆیان لەقەراغ دەریادا لەبەرخۆردابوون و لە چێشتخانە خۆشەکاندا نانیان

خواردبوو، ئەو چێشتخانانەی کە پڕبوون لە شاگردی هەزەلی. خۆشیەکەی لەوەشدابوو کە خەڵکانی تر لەو کاتەدا یان لە قوتابخانەبوون یان لەسەر کاربوون. ڕۆژێکیان سەردانێکی دەریاچەی بورکانی 'سانتۆرینی'یان کرد. بەبەلەم چوونە ناو دەمی مەزنی کراوەی بورکانەکەوە کە 3500 ساڵ لەمەوبەر گڕی ئاگرینی خۆی پەرژاندبوو، ئەو کاتە بورکانەکە نیوەی زیاتری 'سانتۆرینی' نخرۆی دەریا کردبوو. لەکاتی سەردانیاندا بۆ شاری 'تیرا'، ناچاربوون بە ئێستر بە ڕێگاکەدا سەرکەون، ئەو ڕێگایە بەلای سیسیلیاوە لێژترین ڕێگابوو کە لە ژیانیدا بینیبووی. دواتریش لەقەراغ 'ئاوە بورکانیە کۆنەکەدا' چوونە ناو ئاوەکەوە، بەردەکانی هەروەک خەڵوز ڕەشبوون و بەهۆی تیشکی خۆریشەوە سوربووبوونەوە.
چەند پاشنیوەڕۆیەک هەموو خێزانەکە بەدرێژایی قەراغ دەریاکە پیاسەیان دەکرد و بەدوای بەردی جوان و نایابدا دەگەڕان، لە هەمان کاتیشدا ناچاربوون وریای شەپۆلە بەهێزەکان بن، چونکە بەردە وردەکانی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و لەنێوان قاچیاندا بەریەکدەکەوتن و خیزەیاندەکرد. ئەو ڕۆژە سیسیلیایان کردبوو بە دادوەر و تەنها ئەو بەردە جوانەکانی هەڵدەبژارد و بڕیاریدەدا کە بیخەنە ناو جانتاکەوە. بە هەمووی چەند کیلۆیەکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنایەوە. لەوێدا باپیرەی دەیویست کە هەموان دان بەوەدا بنێن کە ئەو هەرە جوانترین بەردی دۆزیوەتەوە.
_ سیسیلیا، بەڕاستی ئەو ڕۆژانەمان خۆشبوون..
سەفەرە هەرە خۆشەکەیان بۆ 'کریتا' لە کۆتایی مانگی نۆدابوو. لەدوای ئەوەوە سیسیلیا بەتەواوەتی ساغبوو. بەڵام لەسەرەتای مانگی یانزەدا چوو بۆ قوتابخانە و دواتریش چەند حەفتەیەک لە خەستەخانە کەوت. پاشانیش چەند جارێک مامۆستاکان سەردانیان کرد و ئەو شتانەیان بۆ گێڕایەوە کە لە قوتابخانەدا کردبوویان.
داپیرەی دواهەمین کەسبوو کە لەلای دانیشت. سیسیلیا منداڵبوو کە داپیرەی چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە، بەڵام قەت چیرۆکە ئاساییەکانی نەدەدا بە گوێچکەیدا. ئەو باسی خواوەندە کۆنەکانی بۆ دەکرد کە

کاتی خۆی چەتە دەریاییەکان بڕوایان پێبووە. هەندێ جاریش چیرۆکی خواوەندەکانی 'سنۆرە'ی بۆ دەخوێندەوە، هەڵبەتە ئەو چیرۆکانەش هەروەک چیرۆکەکانی دی خۆشبوون. لەو دوادواییەشدا کتێبی ئینجیلی منداڵانی بۆ دەخوێندەوە. داپیرەی لەسەردەمی منداڵی خۆیەوە ئەو کتێبەی هەبووە.. بزانە چەندە کۆنە!

ئەمڕۆ باسی داڵە گەورەکانی 'ئۆدین'ی بۆ گێڕایەوە. ناویان 'هوگین' و 'مونین' بووە، ئەو دوو داڵە مەزنە بە سەر دونیادا فڕیون بۆ ئەوەی شتەکانی سەر زەوی ببینن. 'هوگین' واتە 'ئەندێشە' و 'مونین' واتە 'یادوەری'. ئێواران گەڕاونەتەوە بۆ لای 'ئۆدین' و باسی هەموو ئەو شتانەیان بۆ کردووە کە بینیویانە. بەو شێوەیەش 'ئۆدین' هەموو ئەو شتانەی دەزانی کە لەسەر زەوی ڕویاندەدا. بەڵام لەوەش دەترسا کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بفڕن و قەت نەگەڕێنەوە بۆ لای. بەدەرلەوەش داڵەکان کەلاکی گیانەوەریان دەخوارد، بەو شێوەیەش یارمەتی 'ئۆدین'یان دەدا خەڵکی مردوو بدۆزێتەوە. ئۆدین لە ناوەڕاستی ماڵی خواوەندەکاندا لەسەر کورسیەکی بەرزبەرز دادەنیشت کە پێیان دەگوت 'لیسکالف'. ئەو لەنێو خواوەندەکانی تردا داناترین خواوەندبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دڵتەنگترین خواوەندیش بوو. چونکە تەنها ئەو دەربارەی 'ڕاگنارۆک'ی دەزانی، کە ئەویش کۆتایی مەزنی هەموو دونیا بوو و هێدی هێدی لێیان نزیک دەبووەوە.

داپیرەی باسێکی تێروتەسەلی ئۆدین و داڵە گەورەکانی بۆ گێڕایەوە. پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ سیسیلیا خەوی لێکەوت. لە پێشدا سەرخەوێکی شکاند و دواتریش بەقوڵی خەوی لێکەوت. کە خەبەری بووەوە، گوێی لێبوو ئەوانی تر لە خوارەوە دانیشتوون و نانی ئێوارە دەخۆن. تازە دانیشتبوون، چونکە سیسیلیا گوێی لێبوو کە دایکی وتی؛ 'شلەکە بەسەرتاندا دەگێڕم. با کەمێک بە ساکاری نانبخۆین..'

هەمیشە لە ڕۆژی یەکەمی جەژندا بەر لە خواردنی گۆشتی سورەوەکراوی گا، شلەی کەلەرمیان دەخوارد.

سیسیلیا دەفتەری یاداشتە چینیەکەی لەژێر جێگاکەیدا دەرهێنا و کەوتە هەڵدانەوەی پەڕەکانی. چەند حەفتەیەک لەوەوبەر

ملوانکەیەکی مرواری نایابیان بەدیاری پێبەخشی کە دەمێک لەوەوبەر لەباوباپیرانەوە بۆیان مابووەوە. ئینجا لە دەفتەری یاداشتەکەیدا نوسی؛

ئەو کاتەی کە دەمرم زریزە زیوینیەکەی ملوانکەکە دەپچڕێت، کە مرواریە سافەکانی پێوەیە. مرواریەکان بەسەر عەردا خلدەبنەوە و دەچنەوە ناوسکی سەدەفەکانی بن دەریا. بڵێیت کەسێک هەبێت کە لەپاش ڕۆیشتنی من لە قوڵایی دەریاکاندا بەدوای مرواریەکانی مندا بگەڕێت؟ ئەی کەس دەزانێت کە هی من بوون؟ کەس هەیە ئەوە بزانێت کە ڕۆژێک لە ڕۆژان هەموو جیهان بە ملی منەوە بووە؟

هێدی هێدی سەری قەڵەمەکەی دەکرۆشت و بیری لەو شتانە دەکردەوە کە شەوی ڕابردوو لەگەڵ فریشتەکەدا باسیان کرد. هەوڵیدەدا زۆرترین باسی بێتەوە یاد و دواتریش لەدەفتەری یاداشتەکەیدا نوسینی؛

فریشتەکانی ئاسمان قەت نافەوتێن. هۆکەشی دەگەڕیتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان لەشێکیان نیە کە لە خوێن و گۆشت پێکهاتبێت و دواتر لە ڕۆحیان جودا ببێتەوە. شتە خوڵقێنراوەکانی تری جیهان بەو شێوەیە نین. هەموو شتەکانی ئێرە زۆر بە ئاسانی دەفەوتێن. تەنانەت چیایەکیش بەرەبەرە دادەڕمێت و لەدواجاردا دەبێتە زیخ و خاک. هەر دەڵێیت هەموو شتەکانی سروشت بەهێواشی دەسوتێن. دەڵێیت هەموو خەلق لە تێکەڵەیەکدا لەسەرخۆ دەسوتێت.
هەمیشە بەتەواوەتی لەو شتانە ناگەین کە دەیانخوڵقێنین. بۆ نمونە من دەتوانم هێڵکاریەک یان وێنەیەک لەسەر پارچە کاغەزێک بکێشم، بەڵام ئیدی مەرج نیە بزانم ئەو شتەی کە کێشاومە بە چ شێوەیەک هەست بە بوونی دەکات. بەڵام ئەو شتەی کە کێشاومە خۆ شتێکی زیندوو نیە.. لەڕاستیدا شتە هەرە سەیروسەمەرەکە کتومت لەم خاڵەدایە؛ ئەویش ئەوەیە کە من زیندووم!

لەو کاتەدا کە سیسیلیا نەیتوانی هیچی تر بنوسێت، دەفتەرەکەی خستەوە سەر زەویەکە و پاڵێکی پێوەنایەوە بۆ ژێر جێگاکەی.
لەوەدەچوو دیسانەوە خەوی لێکەوتبێتەوە، چونکە لەناکاودا گوێی لە دەنگێک بوو کە وتی؛
_ باش خەوتیت؟
'ئاریل'ی فریشتەبوو. سیسیلیا سەری بەرزکردەوە. لەسەر ئەژنۆ لەخواروی جێگای خەوەکەوە دانیشتبوو.
وەک ئەوەی دڵنیای بکاتەوە وتی؛
_ بەردەوام هەر لێرەدا بووم.
_ بەڵام من نەمبینیت.
کەمێکی پێچوو تا وەڵامی دایەوە؛
_ وابزانم پێم نەگوتیت کە فریشتەکان بە دوو شێوەی جیاواز سەردانی خەڵکی دەکەن. بەشێوە گشتیەکەی بەبێ ئەوەی خۆمانتان نیشان بدەین، هەروا لەلاتان دادەنیشین. هەندێ جاری زۆر بەدەگمەنیش بەتەواوەتی خۆمانتان نیشان دەدەین، بۆ نمونە هەروەک ئێستا.
_ بەڵام لە هەردوو بارەکەدا وەک فریشتەیەک ئێشک دەگرن؟
_ بەڵێ، لەهەردوو بارەکەدا.
_ ئەی ئەو کاتەی کە لەلای کوڕە نەخۆشەکەی ئەڵمانیا دانیشتبوویت بە چ شێوەیەکیان بوویت؟
_ هەروا بۆ خۆم دانیشتبووم لەلای.
_ من بەتەواوەتی لەوە تێناگەم و نازانم تۆ بە چ شێوەیەک دەتوانیت لەم ژورەدابیت و من نەتبینم؟
_ ڕوونکردنەوەی ئەوەیان هێندە سەخت نیە.
_ کەواتە بۆم ڕونبکەرەوە!
_ ئەگەر لە خەوتا لەسەر قەراغ ئاوێک بیت کە قەت لەوەوپێش نەتبینیبێت، ئایا ئەو کاتە ناتوانیت بەشێوەیەک لە شێوەکان بڵێیت سەردانی ئەو قەراغ ئاوەم کردووە؟
_ بەڵی، بەشێوەیەک لە شێوەکان دەتوانم وابڵێم...
_ باشە ئەو خەڵکانەی کە لە قەراغ ئاوەکەن، تۆ دەبینن؟

_ نەخێر، بێگومان نەء.
_ ئێ خۆ دەشتوانیت بەڕاستی لە ڕێگەی کۆمپانیای 'تیابۆرگ'ی گەشت و گوزاریەوە سەفەر بۆ ئەو قەراغ ئاوەبکەیت، ئەو کاتە خەڵکانی ئەوێ دەتوانن بتبینن، چونکە بەڕاستی خۆتیان نیشاندەدەیت.
سیسیلیا تەماشایەکی چاوە یاقوتیە شینە سەوزباوەکانی کرد و وتی؛
_ بەراوردکاریەکی زۆرزانانەبوو.. بەڕاست، ڕێک پێش ئەوەی دایکم خەبەری ببێتەوە، تۆ منت هێنایەوە ناو جێگاکەم.
_ وایە، لەدواچرکەدا فریاکەوتین.
_ ئەگەر فریا نەکەوتینایە، ئەوا توشی شۆکدەبوو. ڕەنگە بەخەیاڵی خۆی وایبزانیە کە چاکبوومەتەوە، ئەوسا دەیگوت؛ 'ئای کە خۆشە سیسیلیا. بزانە، لە پڕێکدا بەتەواوەتی چاکبوویتەتەوە!'
ئاریل پێکەنی؛
_ زۆر سەرنجڕاکێشە لەو کاتەدا تەماشات بکەم کە خەوت لێدەکەوێت.
_ فریشتەکان قەت ناخەون، ها؟
ئاریل سەری ڕاوەشاند؛
_ ئێمە نازانین خەو چیە. تۆ دەزانیت؟
_ بەتەواوەتی نەء..
_ بەڵام بێگومان کەمێک بەرلەوەی خەوت لێبکەوێت، هەستدەکەیت چی لە مێشکتدا ڕوودەدات.
سیسیلیا شانێکی بۆ هەڵتەکاند؛
_ خەوم لێدەکەوێت و تەواو.
_ لەوە تێناگەم و نازانم چۆنە کە دەوێریت بخەویت.
_ بۆ نا؟
_ چونکە نازانیت کە خەبەرت دەبێتەوە یان نا.. بەیارمەتیت هەر هیچ نەبێت دەتوانیت وەسفێکی ئەو کاتەم بۆ بکەیت کە خەوت لێدەکەوێت.

_ ئێ ڕێک لەو کاتەدا کە خەومان لێدەکەوێت، بەخەبەر نین. واتە لەسەر سنورەکەین. لەبەرئەوە هیچ کەسێک پڕاوپڕ نازانێت بە چ شێوەیەک خەومان لێدەکەوێت.
_ ناچێتە ئەقڵەوە، چونکە دەبێت لەو کاتەدا گۆڕانکاریەکی گەورە لەناو مێشکدا ڕوبدات.
_ بەڵام ئەو کاتەی کە ئەوە ڕوودەدات، ئێمە خەومان لێکەوتووە. واتە ناکرێت بیر لەوە بکەینەوە و بڵێین 'ئێستا خەوم لێدەکەوێت'؛ چونکە ئەو کاتە درەنگە و بواری بیرکردنەوە نەماوە. مێشک هەروەکو مەکینەیەک وایە و لە ناکاوێکدا خۆی دەکوژێنێتەوە.
_ بەڵام کە خۆی دەکوژێنێتەوە و کارەبای تێدا نامێنێت، ئەی بە چ شێوەیەک دواتر لەپاش چەند سەعاتێک دەتوانێت خۆی دابگیرسێنێتەوە؟
_ پرسیاری سەخت دەکەیت. ئێمە هەروا خەومان لێدەکەوێت و چەند سەعاتێک دواتر خەبەرمان دەبێتەوە و تەواو. بەڕاست، باوکم هەر دەڵێی سەعاتێکی لە مێشکدایە و خەبەری دەکاتەوە، هەموو بەیانیەک پێنجی بوێت بۆ حەوت خەبەری دەبێتەوە. هەڵدەسێت و زەنگی سەعاتەکە دەکوژێنێتەوە کە دەبێت پێنج دەقە دواتر لێبدات. بەڵام ئەوە تەنها لەو ڕۆژانەدایە کە سور دەزانێت دەبێت هەڵبسێت. دەنا لە ڕۆژانی وەک یەکشەماندا هەر زۆر زیاتر دەخەوێت، تەنانەت ئەو کاتەش خەبەری نابێتەوە کە زەنگی سەعاتەکە لێدەدات.
'ئاریل'ی فریشتە هەردوو دەستی بەملاولادا بادا و وتی؛
_ وابزانم ئا ئەمە هەرە گەورەترین نهێنی سەرتاسەری گەردوونە.
_ ئەمە یەکەم جار نیە کە وا دەڵێیت.
_ ئاخر من تەنها بیر لەو لایەنە ناکەمەوە کە پەیوەندی بە خەونەوە هەیە.
_ ئەی بیر لە چی تریش دەکەیتەوە؟
سیسیلیا لەسەر جێگاکەی خۆی قوتکردەوە و 'ئاریل'یش بە قوڵی تەماشای ناوچاویکرد؛

_ ئێوە لەسەر ئەستێرەیەکی بچکۆلەی ئەم گەردوونەدا لە ئەتۆم و گەردیلە خوڵقێنراون. لێرەدا پێست و موو و پێنج شەش هەستتان بۆ دروستبووە کە دەتوانن لە ڕێگەیانەوە هەست بە چواردەورتان بکەن. بەڵام لەناو ئەو کەللەسەرە ڕەقەدا، کە هەر لە گەچ یان بەردی کلسی دەچێت، مێشکێکی نەرمتان هەیە و لەڕێگەیەوە دەتوانن بخەون و خەون ببینن، بیربکەنەوە و شتەکانتان لەبیربێت.

سیسیلیا وتی؛

_ لەوەوپێش وتم پێم خۆش نیە باسی ئەو شتانەی ناو لەشمان بکەین.

_ کەواتە با باسی ڕۆح بکەین سیسیلیا. ڕەنگە ئەویش لەناو لەشدابێت، بەڵام خۆ ڕۆح بەهەمان شێوەی دڵ و گورچیلەکان بەشێکی لەش نیە.

سیسیلیا دیسانەوە ڕوی تێکردەوە و وتی؛

_ باشە، کەواتە باسی ڕۆح بکە، بەڵام واز لە دڵ و گورچیلە بهێنە.

_ گەورەترین نهێنی ئەو شتەیە کە ئێوە پێی دەڵێن 'یادوەری'. بۆ نمونە تۆ دەتوانیت کەسێک بناسیتەوە کە زۆر زۆر لەوەوپێش بینیوتە. ئەگەر لە شارێکی گەورەدابیت و کەڕەتێکی تر ئەو شاگردە هەزەلیە ببینیتەوە کە زووزوو دەستی دەهێنا بەسەرتا، ئەوا یەکسەر بیرت دەکەوێتەوە، هەرچەندە ئەو کاتەی کە بینیبووت لە گۆڕەپانێکدا بوویت و سەدان کەسی تریشی تێدابوو.

_ لە 'کریتا'ش بوویت؟

سەرێکی بۆ لەقاند؛

_ چ لەم ژورەدابیت و چ لە 'کریتا'، هیچ جیاوازیەکی نیە بۆ من.. ئەو شاگردەت لەیاد دەبێت، وا نیە؟

_ زۆر بەباشی لە یادمە.

ئاریل بەباشی بۆی دانیشتبوو؛

_ هەست بە چی دەکەیت لەناو مێشکتدا کاتێک کە شتێکت 'بیردەکەوێتەوە'؟ ئەی چی بەسەر ئەو هەموو ئەتۆم و گەردیلانەی ناو مێشکتدا دێن؟ تۆ لەو بڕوایەدایت کە لە پڕێکدا بگەڕێنەوە بۆ دواوە و

کتومت بەو شێوەیە بوەستنەوە کە کاتی خۆی ئەزموونی ئەو شتەت کردووە کە ئێستاکە بیری لێدەکەیتەوە؟

سیسیلیا سەریسوڕمابوو و لەتاوا دەمی داپچڕیبوو؛

ـ من قەت لەوەوپێش بەو شێوەیە بیرم لەوە نەکردۆتەوە.

ئاریل لەوێدا کەمێک نائارامبوو و وتی؛

ـ تۆ پێت وایە بەردەکانی قەراغ دەریایەکی خوڕ، ئەو شوێنەیان لەبیربیت کە تەنها دوو خولەک لەوەوپێش تیایدابوون؟

ـ بەهیچ شێوەیەک. هیچ شتێک هێندەی شوێنی بەردەکانی قەراغ دەریا زوترێک لەیاد ناکرێت. بەدەرلەوەش بەرد بەهیچ جۆرێک توانای یادکردنی هیچ شتێکی نیە.

ـ بەلاَم ئەتۆم و گەردیلەکانی ناو مێشکت توانای 'لەیادبوونی' شتەکانیان هەیە و دەزانن شتەکان چەندەها ساڵ لەوەوبەر بە چ شێوەیەک بوون، هەرچەندە پاشان چەندەها شەپۆلی ئەندێشە و یادوەریان بەسەردا هاتووە. باشە بیرکردنەوە یان یادوەری کەمێک لە نەخشێکی دیاریکراوی هەندێ بەردی وردی قەراغ دەریای ئاگایی ناچێت؟

سیسیلیا خۆی تورەکرد؛

ـ تۆش دەتوانیت شتت لەیادبێت. تۆ وتت 'لە بیرمە باپیرەت توشی نەخۆشی هەوکردنی سیەکانی بوو..'

ـ ڕاستە، بەلاَم من خاوەنی ڕۆحێک نیم کە لە سەدان هەزار ئەتۆم و گەردیلە پێکهاتبێت.

ـ ئەی ڕۆحی تۆ لە چی پێکهاتووە؟

ـ ڕۆحی من ڕاستەوخۆ لە هزری خوداوە هاتۆتە دەرەوە.

سیسیلیا باش بیریکردەوە و دواتر وتی؛

ـ ڕەنگە ڕۆحی منیش هەروابێت. ڕاستە ڕۆحی من لە ئەتۆم و گەردیلە پێکهاتووە، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا پێدەچێت ڕاستەوخۆ لە هزری خوداوە هاتبێتەدەرەوە.

ئاریل بەفیزێکەوە قسەکەی سیسیلیای ڕەتکردەوە و وتی؛

ـ بەهەرحاڵ.. لەکاتی ئێستادا باسی ئاسمان ناکەین.

_ تۆ خۆت پەیمانت دامێ کە باسی ئاسمانم بۆ بکەیت..
_ دەتوانین دواتر باسی ئاسمان بکەین سیسیلیا. بەڕاست.. لەو کاتانەدا کە باسی ڕۆحی مرۆڤدەکەین، باسی شتێک دەکەین کە زۆر لە ئاسمانەوە نزیکە.
سیسیلیا سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی بنمیچەکەی کرد؛
_ نەنکم دەڵێت ڕۆح شتێکی خواییە.
_ دیارە نەنکێکی زۆر زیرەکت هەیە.
_ جگەلەوەش نزیکەی هەموو ئینجیل و چیرۆکی خواوەندەکانی 'سنۆرە'ی لەبەرە.
_ تەواوە. ئەوە دیسانەوە هاتەوە بەردەممان!
_ چی هاتەوە بەردەممان؟
_ ڕێک ئەو حاڵەتەی کە ئەو دەتوانێت شتێکی 'لەبەربێت'، بەشێکی ئەو نهێنیە گەورەیە پێکدەهێنێت کە باسیدەکەین. تۆ قەت بیرت لەوە کردۆتەوە کە مێشکی مرۆڤ پڕنهێنیترین مادەی گەردوونە؟
_ نەء، بەر لە ئێستا بیرم لەوە نەکردبووەوە..
_ هەموو ئەو ئەتۆمانەی کە مێشکتیان پێکهێناوە، کاتی خۆی لەسەر ئەستێرەیەکی بچکۆلە دروستبوون. بەڵام دواتر بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەیەکەوە ئالان و بوون بەو شتەی کە ئێوە پێی دەڵێن 'ئاگایی'. واتە بەو شێوەیە ڕۆحی مرۆڤ لە مێشکێکدا دەدرەوشێتەوە کە لەو گەردە نایابانە چنراوە کە کاتی خۆی لە ئەستێرەکانی ئاسمانەوە پرژاوەتە خوارەوە. هەست و ئەندێشەی مرۆڤ لەسەر ئەو گەردی ئەستێرە بێوێنەیە دەلەوەڕێن کە بەردەوام دەکرێت بەشێوەیەکی جیاواز و نوێ پێکەوە بلکێنەوە..
_ کەواتە لەوانەیە کەمێک لە گەردی ئەستێرەکەی 'بەیتلەحم'یش لە مێشکی منیشدا هەبێت.
_ لەبیرکردنەوەکانیشتدایە، لە هەموو ئەو یادوەریانەشدایە کە لەلات کەڵەکەبوون.
سیسیلیا دەیویست لەپەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوە بکات و 'ئاریل'یش بەردەوامبوو لەسەر قسەکانی؛

_ دەشێت شتێکی سەیربێت کە مێشکێکی زیندووبیت و لەگەردووندا بیت. ئەو مێشکە لەناو گەردوونێکی گەورەی دەرەوەدا، هەروەکو گەردوونێکی بچکۆلەی سەربەخۆ وایە. چونکە هێندەی ژمارەی ئەستێرەکان و هەسارەکانی ئاسمان، ئەتۆم و گەردیلە لە مێشکی تۆدایە..

سیسیلیا قسەکانی پێبڕی؛

_ وە ڕەنگە ئەندێشە هەرە هەرە قوڵەکانم و هەرە دورترین ئەستێرەی گەردوون، وەک یەک دوربن لێمەوە.

ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛

_ جیاوازیەکە لەوەدایە کە تەنها مێشک بەئاگایە لە خۆی. هەمیشە دەتوانێت چالاکیەکانی خۆی هەڵسەنگێنێت. گەردوونی دەرەوە ئەو توانایەی نیە. یان با بڵێین گەردوونی دەرەوە ناتوانێت خۆی قوتبکاتەوە و بڵێت؛ 'من خۆمم'. بۆ ئەوە پێویستی بە یارمەتی مرۆڤەکانە.

سیسیلیا دڵیَ خۆشبوو و خەندەیەک گرتی؛

_ منیش لەگەڵ بڕواکەی تۆدام کە دەڵێیت جیاوازیەکی گرنگیان هەیە.

_ بەڵام تا ئێستا پێت نەگوتم کە هەست بەچی دەکەیت کە شتێکت بیردەکەوێتەوە.

_ ئەوەم لەبیرچوو.

_ بەڕاست.. ئەوەشیان هەر شتێکی گرنگە.

_ چی؟

_ کە دەڵێیت "لەبیرمچوو". حەزدەکەیت لەبری پرسیارەکەی پێشووم، باسی ئەوەم بۆ بکە کە ئێوە چۆن چۆنی شتێک لەبیردەکەن.

_ هەر خۆی بۆ خۆی وندەبێت.

ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛ "هەر خۆی بۆ خۆی وندەبێت!"، بەڵام ئەو جارەیان ویستی لاسایی دەنگیشی بکاتەوە.

_ بەڵام ڕووشدەدات کە لە پڕێکدا دیسانەوە سەرهەڵبدەنەوە. هەندێ جار شتەکەم لەسەر زمانە.

_ لەسەر زمانە؟
_ ئیتر ئێمە وا دەڵێین.
_ من پێم وانەبوو کە زمان هیچ پەیوەندیەکی بە یادوەرییەوە هەبێت. خۆ ناتەوێت بڵێیت کە تامی وشەکان و تامی شلیکێک بە هەمان شێوە دەکەن؟
سیسیلیا پێکەنی؛
_ من دەڵێم 'وابزانم دەزانم'. وە زۆرجاریش ئەگەر هیچ کەسێک سەرم لێ تێکنەدات، ئەوا خۆی بۆ خۆی دێتەوە بەردەمم.. باپیرەم دەڵێت قەت پێویست ناکات بەدوای بیرۆکەیەکدا بگەڕێین کە خۆی دەشارێتەوە..
_ بۆ نا؟
_ چونکە هەروەک ماسیەک وایە کە لە قولاپەکە ببێتەوە. ئەو کاتە بەمەلە دەچێتەوە قولایی ئاوەکە و دواتر بەشێوەیەکی قەڵەوتر دەگەڕێتەوە لامان.
ئاریل بەسەرنجەوە سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ کەواتە لەوانەیە ڕاستبکەن.
_ کێ ڕاستبکات؟
_ هەندێ لە فریشتەکان زووزوو دەڵێن ئێمە هەرگیزاو هەرگیز لە شتە زەمینییەکان تێناگەین. بەڵام من قەت کۆڵم نەداوە. بەتەواوەتی هەوڵدەدەم بزانم ژیانی مرۆڤی لەش و خوێن بە چ شێوەیەکە.
_ من زۆر دڵنیا نیم کە بتوانم لەو بارەیەوە یارمەتیت بدەم، چونکە من خۆم لەوە تێناگەم.
ئاریل لەتەنیشت جێگای خەوەکەوە بەرەو بۆشایی سەرەوەی ژورەکە بەرزبووەوە و بەدەم لارەلارەوە وتی؛
_ باشە یەکەمین شتت لەبیرە کە من پێم وتیت؟ مەبەستم لەوەیە کە یەکەمجار یەکتریمان بینی.
سیسیلیا ناچاربوو قەیرێک بیربکاتەوە؛
_ بیرمە لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانیشتبوویت، بەڵام وابزانم کتومت ئەو شتەم لەیاد نیە کە یەکەمجار وتت.

_ "وابزانم کتومت ئەو شتەم لەیاد نیە.."
_ وابزانم وتت 'چۆنیت' یان شتێک لەو بابەتە.. وا نەبوو؟
ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند، پاش ماوەیەکی یەکجار زۆر سیسیلیا دەستێکی بۆ ڕاوەشاند و وتی؛
_ کەمێک بوەستە! لەسەر زمانمە..
_ دەکەواتە بەبڕوای من تا دیسانەوە 'ون نەبۆتەوە'، بەزوترین کات بیڵێ.
ئاریل هەروەکو ئەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار بینی، چووەوە سەر قەراغی پەنجەرەکە و بەهەمان شێوە دانیشتەوە. سیسیلیا تەماشایەکی کرد و وتی؛
_ پرسیت؛ 'باش خەوتیت؟'
_ ئافەرم!
_ هێندە سەختیش نەبوو.
_ بەڵام من لێرەدا نهێنیەکی گەورەم بینی. من پرسیاری شتێکم لێکردیت و وتم ئەو شتەت لەیادە، تۆش لەوەڵامدا وتت 'لەیادم کردووە'. واتە 'بەتەواوەتی ون بووە'! بەڵام کە تۆ ئەو شتەت لە بیرنەبوو، ئەی کەواتە ڕاستودروست لە کوێدا بوو؟
سیسیلیا چیتر تاقەتی نەما و هەناسەیەکی هەڵکێشا؛
_ ڕاستە، بیرکردنەوە لەو حاڵەتە شتێکی سەیرە. هەندێجار لە پڕێکدا شتیکم بیردەکەوێتەوە.
_ ئەی کتومت لە کوێوە ئەو شتەت بیردەکەوێتەوە؟
_ لە سەرمەوە.
ئاریل لەوێدا بەباشی بیریکردەوە؛
_ ئەی کتومت ئەو شتەت دەچێتە کوێوە؟
سیسیلیا پێکەنی؛
_ دەچێتە سەرمەوە!
_ واتە لە سەرەوە بۆ سەر، هەرچەندە هەمیشە باس لە یەک 'سەر' دەکەین. بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەو شتانەی کە دەیبینن و گوێتان لێدەبێت، تەنها شت نین کە لەیادتان دەبێت و لەبیریان دەکەن، وە

دواتریش بیرتان دەکەوێتەوە. لە ڕاستیدا مێشکیش خۆی بۆ خۆی شتێک دەکات. ئەوەش ئەو شتەیە کە ئێوە پێی دەڵێن 'بیرکردنەوە'. هەر لەوە دەچێت کە بەردە بچکۆلەکانی سەر قەراغ دەریا گەورەکە خۆیان بۆ خۆیان جێگۆڕکێ بکەن، بەبێ ئەوەی شەپۆلەکان یارمەتیان بدەن.
سیسیلیا دیسانەوە پێکەنیەوە؛
_ هەوڵدەدەم ئەو وێنەیە بهێنمە بەرچاوم. بیر لەوە بکەرەوە کە لە ناکاودا بەردەکان هەر لە خۆیانەوە بە هەموو ئاراستەیەکدا هەڵبەزودابەزیان بکردبایە!
_ ئەو ئەندێشانەش کە لەوەوپێش بیرت لێکردونەتەوە (بۆ نمونە کە ئەستێرەی سەر دار سنەوبەرەکە ونبووە) پێدەچێت بۆ ماوەیەک بەلابنرێت و دیسانەوە دواتر بهێنرێتەوە ناو ئاگایی. هەر لەوە دەچێت کە ئاگایی بگەڕێنیتەوە دواوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بیر لە هەمان شت بکەیتەوە. وابزانم ئێوە چەندەها وێنەی ئەندێشەی کۆن لێدەدەنەوە، ئەو وێنانەی کە لە بنەڕەتدا دەبوایە دەمێ لەوەوپێش بەتێروتەسەلی بیرتان لێبکردایەتەوە.
_ بەبڕوای من بیرکردنەوەیەکی دیاریکراو خۆی بۆ خۆی دیسانەوە سەرهەڵدەداتەوە. ئێمە هەمیشە ناتوانین خۆمان بڕیاردەربین و بڵێین دەبێت ئەمەمان لەیادبێت و ئەوەمان لەبیربچێتەوە. هەندێ جار بیر لە شتێک دەکەینەوە کە نامانەوێت بیری لێبکەینەوە. جاری واش هەیە شتێکی هەڵە دەڵێین یان نهێنیەکی خۆمان دەدرکێنین. بەو شێوەیەش باسی شتێک دەکەین کە لە بنەڕەتدا نامانەوێت بیڵێین. بەڕاستی جاری واهەیە شتێک دەردەپەڕێنین کە مایەی شەرمەزارییەکی زۆرە.
'ئاریل'ی فریشتە هەر لەسەر قەراغی پەنجەرەکەدا دانیشتبوو و بەردەوام سەرە کەچەڵەکەی بۆ دەلەقاند. دواتر وتی؛
_ کەواتە وابزانم وەک ئەوەیە کە من لێی دەترسام.
_ وەک چی وایە؟
_ ئێوە وەک ئێمە تەنها یەک ڕۆحتان نیە. بەشێوەیەک لە شێوەکان دوو دانەتان هەیە، خۆ پێشی دەچێت زۆرتریێکتان هەبێت. ئەگینا چۆن

دەتوانیت ئەوەم بۆ لێکبدەیتەوە کە ئێوە بیر لە شتێک دەکەنەوە کە ناتانەوێت بیری لێبکەنەوە؟
_ نازانم چۆن.
_ کەواتە دەبێت ئەو جۆرە بیرکردنەوە نەخوازراوانە لەلایەن ئاگایی خۆتانەوە ئاراستە نەکرێت و شتێکی تر دەسەڵاتی بەسەردا هەبێت. ئارادەیەک هەروەکو شانۆیەک وایە و بەهیچ شێوەیەک نازانن کەرەتێکی تر چ بەشێک نمایش دەکرێت.
_ مەبەستت لەوەیە کە ڕۆح شانۆکەیە و هەموو ئەکتەرەکانیش بیرکردنەوە جیاوازەکانن، کە هەمیشە دەردەکەون و ڕۆڵی جۆراوجۆر دەبینن؟
_ بەڵێ شتێک لەو بابەتە. بەلایەنی کەمەوە دەبێت چەندەها ژور لە شانۆی ئاگاییدا هەبێت. هەروەها دەبێت چەندەها دیمەنی ئەو شانۆیەش هەبێت.
ئاریل لەسەر قەراغی پەنجەرەکەوە بەرزبووەوە و بەشێوەی کەوانەیەکی گەورە بەئاسمانی ژورەکەدا فڕی و دیسانەوە لەبەردەم قەراغی خوارەوەی جێگای خەوەکەی سیسیلیادا نیشتەوە و وتی؛
_ دەتوانیت وەسفی ئەو حاڵەتەم بۆ بکەیت و پێم بڵێیت لەناو مێشکتدا هەست بە چی دەکەیت کە بیر لە شتێک دەکەیتەوە؟
_ هەست بە هیچ ناکەم.
_ باشە مێشکت ختوکەی نایەت کە بیر لە شتێکی هەزەلی دەکەیتەوە؟ ئەی کەمێک هەست بە ئازار یان سوتانەوە ناکەیت کە بیر لە شتێکی ناخۆش یان ترش دەکەیتەوە؟
_ بەڵێ بەشێوەیەک لە شێوەکان ختوکەم دێت کە بیر لە شتێکی هەزەلی دەکەمەوە. ڕەنگە کەمێک ئازاریشم هەبێت کە خەیاڵم دەچێتە سەر شتێکی ناخۆش. بەڵام خۆ لەناو سەرمدا ختوکەم نایەت، یان ئازارم نایەت، بەڵکو لە ڕۆحمدایە و ڕۆحیش وەک دەزانیت شتێکی جیاوازە و بەتەواوەتی وەک سەر نیە.
ئاریل بەرەنگاری قسەکەی کرد وتی؛
_ وامدەزانی هەر هیچ نەبێت کەمێک ختوکەی شادەمارەکان دەدات.

سیسیلیا وەک ئەوەی بەربەرەکانێی بکات، تەماشایەکی کرد و وتی؛
_ خۆ ناتەوێت بڵێیت فریشتەکان بیریش ناکەنەوە؟
_ بەڵێ دەمەوێت وا بڵێم، چونکە فریشتەکان بۆیان نیە درۆبکەن.
_ پێمواببێت هەر زۆر زیادەڕۆیی دەکەیت.
_ ئاخر ئێمە بەهەمان شێوەی مرۆڤی ئاسایی بیرناکەینەوە. ئێمە پێویستیمان بەوە نیە کە 'شتێک هەڵبسەنگێنین' بۆ ئەوەی وەڵامەکەیمان دەستبکەوێت. هەموو ئەو شتانەی کە دەیانزانین و هەموو ئەو شتانەش کە دەکرێت بیانزانین، لەیەک کاتدا لە ئاگایماندایە. خودا تەنها ئەوەندە ڕێگەی پێداوین کە گۆشەیەکی بچکۆلەی نهێنیە مەزنەکەی تێبگەین، نەک هەمووی. لەبەرئەوە دەشێت بێدەنگ بین لەو شتانەی کە لێیان تێناگەین.
سیسیلیا بەباشی بیری لە هەموو قسەکانی کردەوە؛
_ کەواتە ئێمە بەشێوەیەکی جیاوازین. ئێمە بەردەوام هەوڵدەدەین زیاتر و زۆرتر تێبگەین. لە ناکاوێکدا شتێکی نوێ دێتە بەرچاومان. هەرە زیرەکەکەشمان خەڵاتی 'نۆبڵ' وەردەگرێت ئەگەر شتێکی ئاوها نوێ دابهێنێت.. بەهەرحاڵ لەو کاتەدا ئەو خەڵاتەی پێدەبەخشرێت کە دۆزینەوەکەی گرنگیەکی گەورەی هەبێت بۆ هەموو مرۆڤایەتی. تاڕادەیەک تێگەیشتنمان وەک لەشمان وایە، لەگەڵ گەشەکردنی لەشماندا تێگەیشتنیشمان گەشەدەکات.
_ بەڵام ڕوشدەدات کە شتێکتان لەبیربچێتەوە. بەو شێوەیەش دوو هەنگاو دەچنە پێشەوە و هەنگاوێک دەگەڕێنە دواوە.
_ ڕەنگە وابێت. ڕاستە پێدەچێت شتێکمان لەبیربچێتەوە، بەڵام ئیتر مەرج نیە کە بەتەواوەتی ونببێت. ڕێدەکەوێت لە ناکاوێکدا هەروەک جنۆکەیەک سەرلەنوێ لەناو قتویەکدا سەرهەڵبداتەوە.
_ ئەوە گەورەترین جیاوازی نێوان مرۆڤ و فریشتەیە. ئێمە نازانین 'لەبیرکردنی' شتێک چیە، لەبەرئەوە لە 'بیرکەوتنەوە'ی شتێکیش تێناگەین. دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر چەندەم دەزانی، ئێستاش هەر ئەوەندە دەزانم، نە زیاتر و نە کەمتر. هاوکات تێگەیشتنی مرۆڤایەتی

لەو ماوەیەدا بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەی سەندەوە. هەموو فریشتەکان ئەو جیاوازییەیان بەلاوە خۆش نیە.

_ ئەوەم نەزانیبوو کە ئێوەش ئیرەیی دەبەن.

ئاریل پێکەنی؛

_ ئاساییە.

_ باشە ئێوە بیرکردنەوەی قوڵتان هەیە؟ ماوەیەکە باپیرەم دەڵێت؛ 'کۆمەڵێک بیرکردنەوەی زۆر قوڵم لا گەڵاڵەبووە'.

ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛

_ هەر بەهۆی ئەوەی کە هەموو ئەندێشەکانمان بەیەک کەرەت لە ئاگاییماندایە، هەرگیز ئەو بوارەمان نیە کە دڵمان بەوە خۆشبێت کە لە پڕێکدا بیرۆکەیەکی قوڵ سەرسامان بکات. ئێمە سنورێکمان نیە کە لێی تێپەڕین، ئاگایی ئێمە لەناو شەپۆلی دەریایەکی تورەدا ناجوڵێتەوە کە ئەندێشە لەیادکراوەکانمان لەپڕێکدا وەک ماسیەکی قەڵەو سەرهەڵبدەنەوە.

_ تۆ وتت فریشتەکان ناخەون..

_ نەخێر ئێمە قەت ناخەوین، لەبەرئەوە قەتیش خەون نابینین. ئەریٚ خەو بینین چ هەستێک دەبەخشێت؟

_ من هەست بە هیچ ناکەم.

ئاریل کەمێک سەری بۆ لەقاند؛

_ کتومت وەکو ئەوە وایە کە من بە ئاسماندا دەسوڕێمەوە و هەست بە هیچ ناکەم. ڕاستەوڕاست وەک ئەوە وایە کە من دەست لە تۆپەڵە بەفرێک دەدەم و هەست بەهیچ ناکەم..

_ خەوبینین شێوەیەکە لە بیرکردنەوە.. یان شێوەیەکە لە بینین. یان ڕەنگە هەردووکیان بێت لە هەمان کاتدا. بەڵام لە کاتی خەودا خۆمان ئەو شتانە دەستنیشان ناکەین کە بیریان لێدەکەینەوە، خۆمان ئەو شتانە دیارینا‌کەین کە دەیانبینین.

_ بەیارمەتیت زیاترێک ئەوەم بۆ ڕونبکەرەوە.

_ لە کاتی خەودا مێشکمان بەتەواوەتی خۆی بۆ خۆی بیردەکاتەوە. تەنها لەو کاتەدا دەکرێت وەک شانۆیەکی ڕاستەقینە بیشوبهێنین.

دواتریش کە خەبەرم دەبێتەوە، هێندەم بیردەکەوێتەوە کە شانۆیەکم بینیوە، یان جاری واهەیە هەر دەڵێی فیلمێکم بینیوە.
_ شانۆیەک یان فیلمێک کە خۆت دروستی دەکەیت، چونکە خۆت ڕۆڵەکان دەبینیت، وایە؟
_ بەشێوەیەک لە شێوەکان وایە بەڵێ.
لەوێدا ئاریل ئارامی لێهەڵگیرا؛
_ ڕەنگە بەو شێوەیە بێت کە خانەکانی مێشک فیلم بۆ یەکتری لێبدەن، هاوکاتیش فیلمەکە لەدوای دواوەی هۆڵی سینەماکەوە دانیشتوە و لەسەر شاشەکە تەماشای خۆی دەکات.
_ ئاه کە بەشێوەیەکی سەیر دەرتبڕی! 'خانەکانی مێشک فیلم بۆ یەکتری لێدەدەن..' لەبەرچاومدایە بە چ شێوەیەکە.
_ چونکە ئێوە لەو کاتانەدا کە خەون دەبینن، هەم ئەکتەرە بەناوبانگەکانن و هەم بینەرانیشن. تۆ ئەوە وەک شتێکی پڕ نهێنی نابینیت؟
سیسیلیا پاڵێکی دایەوە؛
_ بەلای منەوە باسکردنی ئەوە کەمێک ناخۆشە.
_ لە هەموو بارێکدا دەشێت ئەزموونێکی خۆش بێت. تۆ شاهیدی بینینی کۆمەڵێک فیشەکەشێتەی ئەندێشە و وێنەیت لەناو مێشکتدا، هەرچەندە خۆت تەنانەت یەک ساروخیشت نەتەقاندووە. هەر لە نمایشێکی بەلاش دەچێت.
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ ڕێدەکەوێت کە زۆر خۆشبێت، بەڵام جارجارێکیش زۆر ناخۆشە، چونکە ئێمە هەمیشە خەونی خۆش نابینین. هەندێجار خەونی ناخۆش و قێزەوەنیش دەبینین..
لەوێدا ئاریل بەشێوەیەک سەری بۆ لەقاند، وەک ئەوەی بەتەواوەتی لە قسەکانی تێبگات؛
_ بێگومان ئەوە جێگای داخە کە ئێوە بەو شێوەیە ئازاری خۆتان دەدەن. گەر بە شێوەیەکی نمونەیی بڕوانین، دەبوایە بواری ئەوەتان هەبوایە کە ئەو خەونانەتان بوەستانایە کە حەزتان پێیان نیە.

دەبوایە لە حاڵەتی ناچاریدا دەرگایەکی دەربازبوونتان هەبوایە و بتانتوانیبایە لە هۆڵی سینەماکەوە بێنە دەرەوە. بەڵام ئەوە شتێکی مەحاڵە.. ڕێک لەبەرئەوەی کە ڕۆحی خۆتان خودی سینەماکە پێکدەهێنێت و هەموو بەشەکانیشی دەستنیشان دەکات. ئێ خۆ ئێوە ناتوانن لە ڕۆحی خۆتان هەڵبێن. ناتوانن لە بازنەیەکدا بخولێنەوە. یان وابزانم ڕێک ئەو شتە دەکەن. لەبازنەیەکدا دەخولێنەوە هەتا ئەو کاتەی لە ترس و حەشمەتدا لورە و هاوارتان لێبەرزدەبێتەوە.
سیسیلیا نینۆکەکانی دەکرۆژی و وتی؛
_ من نامەوێت بەو شێوەیە بێت. بەڵام هەرچەند دەکەم ناتوانم خۆم بڕیاردەربم و تەنها خەونی خۆش ببینم. زۆر بە ئاسانی ناچارم بەو شتە ڕازیبم کە دێت. ڕێدەکەوێت پاش شەوێکی دورودرێژ خەبەرم ببێتەوە و لەو بروایەدابم کە لە دورگەی 'کریتا' بووم. خۆ لە ڕاستیشدا بە شێوەیەک لە شێوەکان هەر لەوێش بووم، چونکە لە خەونەکەمدا وادەزانم لەو شوێنەم کە خەونەکەمی تێدایە.
ئاریل بەچاوە ڕون و یاقوتییەکانیەوە بەوردی تەماشایکرد و وتی؛
_ وایە ڕاستە!
_ چی ڕاستە؟
_ بەیارمەتیت! قەت لە خەوتاندا ڕوودەدات کە بفڕن؟ یان بە ناو دەرگای داخراودا بڕۆن؟
_ بەڵێ، بەڵێ.. هەموو شتێک لە خەودا ڕوودەدات، یان دەتوانم بڵێم لایەنی کەم نزیکەی هەموو شتێک. لەڕاستیدا پێویستم بەوەش نیە کە بخەوم، دەتوانم هەر لەو کاتانەدا کە بەخەبەرم، ئەندێشەکانم بەرەڵابکەم و بفڕم. دەتوانم بەهەموو ئەمماڵەدا بێم و بچم.. دەشتوانم بچمە وڵاتەکانی تر. کەرەتێکیان لە خەونمدا لەسەر مانگ بووم. لەخەوەکەمدا من و ماریانا لە پشت کارگەی شیرەمەنیە کۆنەکەوە کەشتیەکی ئاسمانیمان بینی، دواتر هەروا دەستمان نا بە دوگمەیەکدا و فڕین.

ئاریل دیسانەوە لە شوێنی خۆی بەرزبووەوە و بە بۆشایی ژورەکەدا دەفڕی. پاش گەڕانێکی کەم بە ژورەکەدا، لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکە نیشتەوە و وتی؛
_ کەواتە ئەوەشمان بۆ ڕونبووەوە.
سیسیلیا وەک ئەوەی کۆڵبدات سەرێکی بۆ ڕاوەشاند و وتی؛
_ من لە هیچ تێناگەم.
ئاریل پەنجەی بۆ ناوچەوانی سیسیلیا ڕاکێشا و وتی؛
_ لەبیرکردنەوەکانتاندا دەتوانن سەرتاپای ئەو شتانە بکەن کە فریشتەکان بەهەموو لەشیان دەیکەن. لەو کاتانەدا کە دەخەون، دەتوانن کتومت لەناو سەرتاندا هەموو ئەو شتانە بکەن کە فریشتەکان لە تەواوی خەلقدا دەیانکات.
سیسیلیا کەمێک پەشۆکا و وتی؛
_ من قەت لەوەوپێش بیرم لەوە نەکردبووەوە..
ئاریل بەردەوامی بە قسەکانیدا؛
_ هێشتا شتی تریش ماوە.. لەکاتی خەوبینینتاندا هیچ شتێک ناتوانێت ئازارتان بدات یان زیانتان پێبگەێنێت. بەو شێوەیەش هەروەک فریشتەکانی ئاسمان پارێزراون و هیچ هێزێک نیە کە بتوانێت ئازارتان بدات. کەواتە ئەو شتانەی کە دەیبینن تەنها وە تەنها ئاگاییەکی پەتیە و هیچی تر، وە لەو کاتانەدا پێنج هەستەکانی لەشتان بەکارناهێنن.
سیسیلیا بیرۆکەیەکی هەر زۆر نوێی بەخەیاڵدا هات. لەسەر جێگاکەی خۆی قوتکردەوە و وەک کەسێکی گەورە وتی؛
_ کەواتە لەوانەیە ڕۆحمان نەمربێت! ڕەنگە ڕۆحمان هەروەک فریشتەکانی ئاسمان نەمربێت.
ئاریل پشتگیری قسەکانی کرد و وتی؛
_ بەلایەنی کەمەوە ئێستاکە کەمێک باشتر لە فریشتەکانی ئاسمان تێدەگەیت. هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی باسی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤمان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەمێک زیاتر شارەزای شتە ئاسمانیەکان بوویت. چونکە وێنەی ئاسمان لەزەویدا دەبینرێتەوە.

سیسیلیا دیسانەوە وەک گەورەیەک قسەیکرد و وتی؛
_ رۆح شتێکی خوایانەیە، وا نیە؟
سیسیلیا هیچ وەڵامێکی دەستنەکەوت، لەبەرئەوە هەوڵیدا شتێک بڵێت کە وا لە ئاریل بکات بەجێی نەهێڵێت. وتی؛
_ تۆ خۆت پەیمانت دامێ کە باسی شتە ئاسمانیەکانم بۆ بکەیت؟
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ ڕاستە، بەڵام ئائێستاکە وا دایکت خەریکە بێتە سەرەوە بۆ لات، لەبەرئەوە دەبێت بەپەلە لە ئاوێنەکەوە بڕۆم.
سیسیلیا تەماشایەکی ژورەکەی کرد؛
_ کام ئاوێنەیە؟ ئەرێ ئەو ئاوێنەیە چیە کە تۆ بەردەوام هەر باسی دەکەیت؟
ئاریل لەسەر کورسیەکەی هەستا و بەسەر عەردەکەدا ڕۆشت. هەتا دەهات سیمای تەڵختر و ناڕونتر دەبوو. لەو کاتەدا کە بەتەواوەتی دیارنەما وتی؛
_ سیسیلیا، هەموو خەلق ئاوێنەیەکە.. هەموو جیهان نهێنیەکە.

***

چەندەها ڕۆژ تێپەڕی و ئاریل خۆی نیشانی سیسیلیا نەدایەوە. بەڵام هەمیشە لەو ماوەیەدا کەسێکی خێزانەکە لەسەر کورسیەکەی بەردەم جێگای خەوەکەیدا دادەنیشت. هەرچەندە دایکی و نەنکیشی فێری دەرزی لێدانبووبوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا 'کریستینا' نزیکەی هەموو ڕۆژێک سەرێکی هەر لێدەدا. سیسیلیا هەمیشە ڕۆژەکان و کاتی ڕۆژەکانی بۆ جودا نەدەکرایەوە. بەڵام جارجارێک کە تاقەتی دەبوو، بیرۆکەیەکی نوێی لە دەفتەری یاداشتە چینیەکەدا دەنوسی.
پێڵاوی خلیسکێنەکەی و تاخورکەکەشی بەو دیوارەوە هەڵسپێردرابوون کە لەنێوان ژورەکەی خۆی و ژوری نوستنەکەی دایک و باوکیدا بوو. هێشتا هەر زستانبوو و وەرزی خلیسکێنەی سەربەفر بەسەرنەچوبوو. سیسیلیا بەتەواوەتی بڕیاریدابوو بەر لەوەی بەفرەکە بتوێتەوە، چاک ببێتەوە. ئاخر نەیدەتوانی ساڵێکی ڕەبەق بوەستێت و چاوەڕوانی بەفری ساڵی داهاتووبکات تا خلیسکێنەی لەسەر بکات.
بەهیچ جۆرێک ناوی 'ئاریل'ی لەلای ئەوانی تر نەدرکاند. ئەو هیچ پەیوەندیەکی بە ئەندامەکانی تری خێزانەکەی سیسیلیاوە نەبوو. ڕاستە سیسیلیا ئەندامی خێزانێک بوو لە 'سکۆتبو'، بەڵام لەهەمان کاتیشدا مرۆڤێک بوو کە لە نێوان ئاسمان و زەویدا تاک و تەنها وەستابوو.
بەڵام ئەی چی لێهات؟ ئەی پەیمانی پێنەدا زیاترێک باسی شتە ئاسمانیەکانی بۆ بکات؟ هەر خۆشی نەیوت فریشتەکان درۆ ناکەن؟

بڵێیت هەڵیخڵەتاندبێت؟ بڵێیت هەرئەوەندە مەبەستی بووبێت کە سیسیلیا باسی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤی سەر زەوی بۆ بکات و دواتر سوک و باریک بەبێ ئەوەی پەیمانەکەی خۆی بەرێتەسەر تێیتەقاندبێت؟
سیسیلیا چاوی کردەوە و ساتێک دوای ئەوە دایکی هاتە ژورەکەیەوە و لە قەراغ جێگاکەیدا دانیشت. سیسیلیا هەروا بەچاوێکی پڕ لە بەتاڵییەوە چاوی تێبڕیبوو و بەمنگەمنگێکەوە وتی؛
_ چیە دەڵێی دیسانەوە پیازت جنیوەتەوە؟
دایکی سەرێکی بۆ ڕاوەشاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیسیلیا وتی؛
_ لەوە دەچێت زیاد لەڕادە پیاز بخۆن.
دایکی دەستێکی خستە ناو قژی سیسیلیاوە و دەستی بەسەردا هێنا؛
_ وا خەریکە دەبێتە دوانزەی شەو. ئەوانی تر دەمێکە خەوتوون و منیش دەمەوێت بچمە جێگاوە و هەوڵدەم بخەوم.
_ هەوڵدەیت بخەویت؟
_ ئاااە.. حەبێکی خەو دەخۆم.
_ خۆت ڕامەهێنە بەو شتانە.
_ ئێ خۆ بەهیچ جۆرێک زەرەریان نیە.
سیسیلیا سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی کرد؛
_ خۆزگە دەمزانی بۆچی ئێمە بەو شێوەیە دروستبووین کە دەبێت بخەوین.
_ ئێ خۆ خەو شێوەیەکە لە پشوودان. هەندێک خەڵک لەو بڕوایەدان کە پێویستیمان بە خەوبینینیش هەبێت.
_ بۆ؟
دایکی هەناسەیەکی هەڵمژی و بەتوندی دایەوە؛
_ نازانم.
_ وابزانم من دەزانم بۆ.
_ بۆ؟
_ وابزانم هەر لەبەرئەوە پێویستیمان بەخەوبینین هەیە، بۆ ئەوەی لەخەیاڵدا بژین.

ـ سیسیلیا، تۆ زۆر سەیر بیردەکەیتەوە.
ـ ئاخر خەڵکانێکی زۆر لەڕادەبەدەر ژیانیان تاڵە و ڕەنگە لە خەفەتدا بمرن ئەگەر تاوناتاوێک خەوێکی خۆش لەنێوان ئەو هەموو خەمەدا نەبینن.
دایکی دەموچاوی سیسیلیای بە پەڕۆیەکی تەڕ سڕی و جلێکی پاکی شەوی کردە بەری.
ـ گوێمەدەرێ کە ئەوەندە بێهێز و ماتم. بەڕاستی خۆم پێم وایە کەمێک باشتر بووبم.
ـ بەڵێ، لەوانەیە..
ـ کریستیناش هەر واناڵێت؟
دایکی پشتگیری قسەکەی کرد و وتی؛
ـ ئەو وتی دەبێت چاوەڕوان بین و بزانین چۆن دەبێت.
ـ لەوانەیە سبەینێ بتوانم کەمێک هەڵسم. بۆ نمونە هەر بۆ قاوەخواردنەوەی بەیانی..
ـ ڕۆژ بەڕۆژ وەریدەگرین.
ـ ئاخر دەمەوێت بەم زوانە پێڵاوی خلیسکێنەکەم تاقیبکەمەوە. تۆ خۆت پەیمانت دامێ؟
ـ هیچ خەمت نەبێت، پێڵاوەکانت ئامادەیە. دەی هەر شتێکت پێویست بوو زەنگێکمان بۆ لێدە و دێین بەدەمتەوە، تەنانەت ئەگەر هەر بۆ ئەوەش بێت کە قسە لەگەڵ یەکێکدا بکەیت. کەمێکی تر باوکت دێت و لەلات دادەنیشێت.
ـ هیچ پێویست ناکات بێت.
ـ ئاخر ئێمە خۆمان پێمان خۆشە بەو شێوەیە بێت.
ـ بەڵام بەلاتەوە ئاسایی بێت و سەرت نەسوڕمێت ئەگەر گوێت لە دەنگم بوو، چونکە من جارجارێک قسە لەگەڵ خۆمدا دەکەم.
ـ زوو زوو قسە لەگەڵ خۆتدا دەکەیت؟
سیسیلیا دیسانەوە سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی کردەوە؛
ـ نازانم.
دایکی دەستی کردە ملی و توووند نوساندی بە خۆیەوە، ئینجا وتی؛

_ تۆ جوانترین کچی هەموو دونیایت. بێ تۆ ئەم دونیایە ناخۆش و بەتاڵە.
سیسیلیا خەندەیەک گرتی؛
_ شەوشادێکی هەر زۆر پڕمانات لێکردم.
چەند چرکەیەک دوای ئەوەی دایکی لە ژورەکەی چووە دەرەوە، خەوی لێکەوت. پاش قەیرێک لەدەنگی شتێک خەبەری بووەوە کە بەر پەنجەرەکە دەکەوت. چاوی کردەوە و لەو دیو پەنجەرەکەوە دەموچاوی 'ئاریل'ی بینی. لەبەر ڕۆشناییە ئاڵتونیەکەی گلۆپەکانی سەر دارەکەوە، هەر لە فریشتەیەکی ئاڵتونی ڕوسی دەچوو کە کەڕەتێکیان وێنەکەی لە یەکێک لە گۆڤارە زانستیەکاندا بینیبوو. دڵنیا نەبوو، بەڵام خۆ لە وێنەیەکی سەردەمی منداڵی مەسیحیش دەچوو.
دەستێکی بۆ ڕاوەشاند و چرکەی دواتر هەر لەپەنجەرەکەوە خۆی هەڵدایە ئەودیوەوە و لەبەردەم مێزی نوسینەکەیدا وەستا. پەنجەرەکەش هیچی لێنەهات و هەروەک خۆی بەساغی مایەوە.
سیسیلیا چاوی داچڕی؛
_ ڕاستە پێکەوە چەندەها شتمان باسکرد، بەڵام بەڕاستی نازانم تۆ چۆن دەتوانیت ئاوها لە پەنجەرەکەوە بێیتە ژورەوە.
ئاریل بەرەوڕوی هات و لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەیەوە دانیشت. باشبوو هێشتا باوکی نەهاتبووە ژورەوە بۆ لای. ئاریل وتی؛
_ ئەوە شتێکی هێندە گرنگ نیە، لەبەرئەوە پێویستناکات لەسەری بڕۆین.
سیسیلیا لەسەر جێگاکەی خۆی قوتکردەوە و قاچێکی لەژێر لێفەکەیدا دەرهێنا و خستیە سەر لێفەکەی. ئەوجا پرسی؛
_ ئەوە تۆ لە کوێ بوویت؟
ئاریل وەڵامیدایەوە و وتی؛
_ ئاخر بەردەوام خەڵکانی تر سەردانیان دەکردیت.
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ هەر لەبەرئەوەبوو کە ماوەیەکی زۆرە دیارنەبوویت؟

ئاریل وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە، لەبری ئەوە بەڕویەکی خۆشەوە وتی؛
_ وا مانگەشەوێکی پڕە. لەدەرەوە تریفەی مانگەکە لە بەفرەکەدەدات و هەر دەڵێی ڕۆژە.
_ چەند جوانە! خۆزگە بمتوانیایە بچمە دەرەوە و بەچاوی خۆم مانگم ببینیایە.
_ بۆ ناتوانیت؟
_ هەستدەکەم زۆر باشتریکم..
_ زۆر باشە! ئێ خۆ خۆشیش نیە هەمیشە هەرئاوها ناساغبیت.
_ بەڵام بڵێیت ڕێگەم پێبدەن؟
'ئاریل'ی فریشتە لەسەر کورسیەکە بەرزبووەوە و بە ئاسمانی ژورەکەدا بەدەوری تاخورک و پێڵاوی خلیسکێنەکانیدا سوڕایەوە.
_ بێگومان دایک و باوکت ڕێگات پێنادەن بەم نیوە شەوە بچیتە دەرەوە.
_ ئەی تۆ ڕێگەم پێدەدەیت؟
ئاریل بەشێوەیەکی پڕ نهێنی سەرێکی بۆ لەقاند. سیسیلیاش یەکسەر بەلەقەفرتێ لێفەکەی لەخۆی کردەوە و وتی؛
_ ئەگەر فریشتەکانی ئاسمان ڕێگەی شتێک بدەن، قسەی ئەوانی تر ناخوات. جگەلەوەش هەر هەموویان خەوتوون.
_ باشە، پیاسەیەکی بچکۆلە دەکەین. بەڵام دەبێت جلی باش لەبەربکەیت، تا نەبیتە تۆپەڵە نوقلێکی گەورەی بەستوو.
سیسیلیا هەستایە سەرپێ و هاتە سەر عەرزەکە. زۆر بەباشی بە پێوە بۆی وەستا و بەهیچ شێوەیەکیش سەری گێژی نەدەخوارد. دواتر وتی؛
_ دەمەوێت پێڵاوی خلیسکێنەکە تاقیبکەمەوە.
چرکەی دواتر لەبەردەم کەنتۆرەکەدا خۆی بینیەوە. هەر لەسەرەتای مانگی یانزەوە حسابی بۆ جلی زستانە کردبوو و هەر هەموویانی لە ڕەفەیەکی تایبەتیدا دانابوو. جلی شەوی داکەند و فانیلەی دەرەوە و پانتۆڵی ژێرەوە و بلوسی ئەستور و پانتۆڵی تایبەتی خلیسکێنەی سەربەفر و قەمسەڵەیەکی گەرمی دەرهێنا. ملپێچ و کڵاو و دەستکێش

و گۆڕەوی ئەستوریشی دۆزیەوە. پاش نەختێک لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشت و و قەیتانی پێڵاوەکانی بەست. کە لێبووەوە تەماشایەکی 'ئاریل'ی کرد و وتی؛

_ بەیارمەتی دەتوانیت پێڵاوی خلیسکێنەکەم بۆ هەڵبگریت؟

چونە دالانەکەوە و بەئەسپایی بەپلیکانەکاندا هاتنە قاتی خوارەوە. سیسیلیا دەرگای دەرەوەی کردەوە و ئاریل بەخۆی و پێڵاوی خلیسکێنەکەی سیسیلیاوە چووە دەرەوە. دواى ئەو خۆشی چووە دەرەوە و دەرگاکەی بە هێواشی لەدوای خۆی داخست.

بەلای ئەمبارەکەدا تێپەڕین. لەوێوە گردێکی لێژ بەرەوڕوی چەمەکەی خوارەوە و دارستانی سنەوبەرەکاندا دەیڕوانی. سیسیلیا پێڵاوی خلیسکێنەکەی لەپێکرد و هەردوو دەستی خستە ناو ئەڵقەی داردەستەکانەوە. تریفەی مانگیش سەربەفرەکەی بە یەکجاری ڕووناکردبووەوە.

سیسیلیا وتی؛

_ دەمەوێت لە گردەکەوە بچمە خوارەوە. باشترە ڕابکەیت بە دوامدا، چونکە زۆر دەمێکە چاوەڕوانی ئا ئەمە بووم.

لەدوای ئەوەوە بەرەوخوار بووەوە، بەڵام 'ئاریل'ی فریشتە بەدوایدا ڕاینەکرد، بەڵکو لەتەنیشتیەوە بە ئاسماندا دەفڕی. کەمێک دواتر ئاریل وتی؛

_ ئێستاکە هەردووکمان دەفڕین. تەنها جیاوازی لەوەدایە کە من هەست بەهیچ ناکەم.

سیسیلیا بەدەنگێکی بەرز وتی؛

_ لەڕادەبەدەر خۆشە.. هەر زۆر زۆر خۆشە!

کە گەیشتنە خوارەوەی گردەکە، سیسیلیا کەوتە ناو بەفرە نەرمەکەوە و لەوێدا هەردووکیان پێکەنین.

سیسیلیا هەستایە سەرپێ، ئاماژەی بۆ دارستانی سنەوبەرەکەکرد و وتی؛

_ ئا لێرەوە ڕێگایەکی زۆر خۆش بۆ 'ڕاونەکۆلن' دەڕوات. لەوێشەوە دیمەنی هەموو دۆڵەکەت لەبەرچاودادەبێت.

بۆ ساتێک لەوەدەچوو ئاریل ئەندازەی سیسیلیا بگرێت، بەڵام تەنها بۆ ساتێک. ئینجا وتی؛
_ بەڵام دەتوانیت تا ئەوەندە دور بڕۆیت؟
سیسیلیا ملی ڕیگای گرتبوو و بەدەنگێکی خۆشەوە وتی؛
_ لە ئێستادا زۆر بەهێزم و هەست دەکەم هێزی گایەکم تێدابێت!
سیسیلیا لایدایە سەر جێشوێنێکی قوڵی ناو بەفرەکە و ئاریلیش بەچواردەوریدا دەخولایەوە، هەر بەچەشنی سەگێک دەچوو کە یەکشەممان بۆ پیاسە دەیبەنە دەرەوە، بەڵام ئەم بە ئاسمانەوە دەفڕی، تاوێک بەلای چەپدا و تاوێکی دی بەلای ڕاستیدا. هەندێ جاریش ناچاربوو بەدوایدا ڕابکات. سیسیلیا پرسی؛
_ سارد نیە کە ئاوها بە پێی پەتی بەناو بەفرەکەدا دەڕۆیت؟
ئاریل بەسەبرەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛
_ دیسان لەسەرەتاوە دەستپێبکەینەوە؟
سیسلیا پێکەنی؛
_ ئاخر بینینی ئەو حاڵەتە لەرادەبەدەر جوانە.. تۆ دەزانیت لە هیندستان هەندێ کەسانی ڕۆحانی هەن کە دەتوانن هەموو هەستەکانیان خامۆشبکەن، بەو شێوەیەش نە سەرمایان دەبێت و نە گەرماش. بەڕاستی دەشتوانن لەسەر کۆمەڵێک بزمار پاڵبکەون و بخەون.
ئاریل سەری بۆ لەقاند؛
_ ئێمە هێندەی نەرویج سەردانی هیندستانیش دەکەین.
چوونە ناو دارستانەکەوە و لەوێوە ڕێگاکەیان بەنێوان قەدی ڕیزە درەختەکاندا دەڕۆیشت. هەندێ جار ئاریل ڕێگاکەی قەدبڕ دەکرد و ڕێک بەناودارەکاندا تێدەپەڕی. لەشوێنێکدا بەناو دەوەنێکی چڕدا ڕۆشت، بەڵام دەوەنەکە هەروەک تەم وابوو بەلایەوە.
لەدواهەمین تەپۆڵکەدا بەرەو 'ڕاونەکۆلن'، سیسیلیا ناچاربوو هەنگاوی بچکۆلە بچکۆلە بنێ، تا بەخۆی و پێڵاوی خلیسکێنەکانیەوە نەخزێت. پاش ماوەیەک گەیشتنە سەری سەرەوەی تەپۆڵکەکە. لەوێدا گردەکە هیچ دارێکی پێوە نەبوو. سیسیلیا یەکێک لە داردەستەکانی

بەرزکردەوە و ئاماژەی دیمەنە بەستووەکەی ئەو ناوەی پێکرد، هەموو شوێنێک سەرتاپا نوقمی شینایی تریفەی مانگەشەوەکەبووبوو. ئینجا وتی؛

_ کە منداڵبووم وامدەزانی ئا ئەوێ سەقفی جیهانە. کە نەنکم باسی 'ئۆدین'ی بۆ دەکردم و دەیگوت لەسەر کورسیەکی بەرزبەرز دانیشتووە و سەیری دونیایکردووە، وا دەهاتە بەرچاوم کە ئالەوێدا دانیشتبێت. خۆ تۆ چیرۆکی داڵەکانی 'ئۆدین'ت بیستووە؟

ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛

_ هوگین و مونین. واتە 'ئەندێشە' و 'یادوەری'.

_ نەنکیشم هەروای دەگوت. بەشێوەیەک لە شێوەکانیش 'ئۆدین' ئەندێشە و یادوەری خۆی ڕەوانەی جیهانی دەرەوەکردووە.

ئاریل دیسانەوە سەری بۆ لەقاندەوە و لەوێدا شتێکی سەیری وت؛

_ لەوانەیە هێندەت لەیادبێت کە لەوەوپێش باسی 'چاوی ناوەوە'مان کرد و وتمان هەموو مرۆڤێک هەیەتی و وتیشمان بەتایبەتی بەلای ئەو کەسانەوە گرنگە کە کوێرن. ئەوەش هەروەها لە 'ئەندێشە' و 'یادوەری' پێکهاتووە. واتە 'هوگین' و 'مونین' چاوی ناوەوەی ئۆدین بوون.

سیسیلیا سەریسوڕما. بۆ قەت لەوەوپێش خەیاڵی بۆ ئەوە نەچوبوو؟ 'ئاریل'ی فریشتە درێژەی بە قسەکانیدا؛

_ خودا هەموو شتێک دەزانێت. دەشتوانێت لە یەک کاتدا لە چەند شوێنێکی جیاوازدابێت. ئۆدین ئەو توانایەی نەبوو، بەڵام هەر هیچ نەبێت خاوەنی ئەو دوو داڵەبوو. بەو شێوەیە ئەویش تا ڕادەیەک هەموو شتێکی دەزانی.

سیسیلیا دیسانەوە داردەستەکەی بەرزکردەوە و بەرەو دۆڵەکەی ڕاکێشا. ئینجا پرسی؛

_ ئەو کێڵگانە دەبینیت؟ وابزانم لە هەر تاکەماڵێکی ئەو ناوەدا کەسێک دەناسم. قوتابخانەکەمان لەو خوارانەوەیە.. ئا ئەو شتە سپییە خەتخەتەش ڕوبارەکەیە کە بەو ناوەدا لولیخواردووە. ئەو

ڕوباره ناوی 'لیرا'یه. ماریانا لەو خانوه زەردەی بەری ئەوبەردا دەژی.
_ هەموو ئەوانه باش دەزانم، سیسیلیا.
_ لەخوارەوەی لای چەپدا ڕوناکیەکی کزی 'کلیوفته' دیاره و سەری سەرەوەی ئەو بەرزاییه ناوی 'هێکسەبیرگۆسن'ە. 'یاسیەم'یش لەو بەرەوەیه.
ئاریل سەری بۆ لەقاند؛
_ هەموو ئەوانه دەزانم.
_ لەو خوارانەشەوه ئەمبارەکەمان دەبینیت. دەشتوانیت کەمێکی ماڵەکەمان لەپشت ئەو دارەوه ببینیت که گڵۆپەکانی پێوەیه. پەنجەرەی چەپی قاتی یەکەم، ژورەکەی منه.
ئاریل وتی؛
_ ئێ من خۆم چەندەها جار لەو پەنجەرەیەوه هاتوومەته ژورەوه.
ئاریل چارەکه مەترێک له زەویەکەوه بەرزبووه و بەو شێوەیەش لەکاتی قسەکردنیاندا دەیتوانی ڕێک تەماشای ناو چاوانی سیسیلیا بکات. چاوه یاقوتیه شین و سەوزباوەکەی لەبەر تریفەی مانگەشەودا دەبریسکانەوه. وتی؛
_ ئەگەر ئا ئێستاکه لەو خوارانەوه لەبەردەم پەنجەرەکەتدا بوەستاتایه و بەرەوڕوی سەرەوه تەماشای 'ڕاونەکۆلن'ت بکردبایه، ئەوا هەردووکمانت لەسەر ئەم گردە دەبینی. ئەو کاتە ڕەنگە هەردووکمان دەستمان بۆ ڕاوەشانبایتایه.
سیسیلیا بێدەنگ بوو. بەڕاست، قسەیەکی کەمێک سەیری نەگوت؟ سیسیلیا هەستیدەکرد شتێک له شتەکان ئاسایی نیه، بەڵام نەیدەزانی ئەو شته چیه. وتی؛
_ ڕەنگە باوکم لە هەر دەقەیەکدا خۆی بکات بە ژورەکەمدا و سەرێکم لێبدات، هەڵبەته هەر بۆ ئەوەی بزانێت خەوتوم یان نا. ئەگەر ئا ئێستاکه بچێته ژورەکەمەوه، هێندە سەری دەسوڕمێ که قەت قەت لەبیری نەچێتەوه. ئەوسا دەڵێ 'ئۆیی.. ئۆیی... وابزانم بولبولەکه له هێلانەکەیدا فڕیوه'!

_ بچم بزانم هێشتا خەوتووە یان نا؟
_ دەتوانیت؟
بۆ ساتێک ئاریل ون بوو و سیسیلیاش بەتاق و تەنها لە نێوان زەوی و ئاسماندا مایەوە. بۆ چەند چرکەیەک هەستیکرد برایەکی دوانەیەتی و ونیکردووە. پاش نەختێک لەتەنیشتیەوە وەستایەوە. بە دەنگێکی دڵنیاوە وتی؛
_ هەردووکیان خەوتوون. دایکت سەری چەقاندۆتە ملی باوکت. سەعاتەکەشیان خستۆتە سەر سێ و نیو.
سیسیلیا لە خۆشیدا هەناسەیەکی هەڵکێشا. دیسانەوە ئامازەی بۆ دیمەنی چواردەورەکەیان کردەوە و وتی؛
_ تا ئێستاش نازانم مانگ بە چ شێوەیەک ئەو هەموو ڕوناکیە پەخشدەکاتەوە.
_ لەبەرئەوەیە کە دونیا تاریکە. کاتێک ڕوناکیەک لەناو تاریکیدا دەدرەوشێتەوە، هیچ تاکە تیشکێکی ون ناکات لە ڕێگادا.
سیسیلیا لەبەرامبەری قسەکانیدا وتی؛
_ بەڵام خۆ مانگ خۆی ڕوناکی نابەخشێت. ئەو وەک ئاوێنەیەک وایە و ڕوناکی لە خۆرەوە وەردەگرێت.
ئاریل بە گرنگیەوە سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ لەبنەڕەتدا خۆریش خۆی بۆ خۆی ڕوناکی نابەخشێت، ئەویش وەک ئاوێنەیەک وایە و ڕوناکی لە خوداوە وەردەگرێت.
_ بەڕاست؟
_ ئێ خۆ لەبەرچاوی خوادا هەڵتناخڵەتێنم.
_ بێگومان نەء... بەڵام هەر ئەوەندەیە کە من قەت خەیاڵم بۆ ئەوە نەچووبوو کە هەر ڕێک بەهەمان ئەو شێوەیەی کە مانگ ڕوناکی لە خۆرەوە وەردەگرێت، خۆریش ڕوناکی لە خواوە وەربگرێت.
سیسیلیا خۆیدا بەسەر داردەستەکانیدا و چاوی بڕیە بەفرەکە. ئەو کاتەی کە سەری هەڵبڕی، ئاریل لە شوێنی خۆی نەمابوو. بەبەرزی دە بیست سانتیمەترێک لەبەردەمیدا بەئاسمانەوە لارەلاریدەکرد. وتی؛

_ سیسیلیا، تۆش ڕوناکی لە خواوە وەردەگریت. تۆش ئاوێنەی خودایت. تۆ بەبێ خۆر چی دەبوویت و خۆریش بەبێ خودا چی دەبوو؟
سیسیلیا خەندەیەکی گەورەی خستە سەر لێوانی؛
_ کەواتە منیش مانگێکی بچکۆلانەم.
_ هەر واشە و ئائێستاکە ڕوناکی بەرەو من پەخشدەکەیتەوە.
_ زۆر بەشێوەیەکی سەیر دەریدەبڕیت. شتەکان هێندە گرنگ و جدی باسدەکەیت، لەتاودا ئارەقێکی سارد بە پشتمدا دێتە خوارەوە.
'ئاریل'ی فریشتە سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ بێگومان کەمێک بەشێوەیەکی گرنگ و جدی باسی شتە مەزنە ئاسمانیەکان دەکەین.
_ دەتەوێت ئێستاکە باسی ئاسمانم بۆ بکەیت؟
_ من وا دەستم پێکردووە.
ئاریل دەستی بۆ ئاسمان ڕاکێشا. ڕوناکی مانگ هێندە بەتینبوو، تەنها چەند ئەستێرەیەکی کەم دیاربوون، ئەوانیش لەو شەوەدا وەک خاڵێکی زەرد دەردەکەوتن.
ئاریل وتی؛
_ بەر لەهەموو شتێک دەبێت لەوە تێبگەیت کە تۆ خۆت لە ئاسماندایت.
_ ئا ئەمە ئاسمانە؟
'ئاریل'ی فریشتە سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ ئەی قابیلە لە کوێدا بین؟ ئەم زەویە تەنها خاڵێکی بچکۆلەی ئەو ئاسمانە فراوانەیە و لەوەندە زیاتر هیچی تر نیە.
_ من قەت لەوەوپێش بەو شێوەیە بیرم لێنەکردبووەوە.
_ ئا ئەمە ئاسمانی زەویە سیسیلیا. ئەمە باخچەی عەدەنە و مرۆڤی لەسەر دەژی. فریشتەکانیش لەشوێنەکانی تردا دەژین.
_ مەبەستت لەوەیە لە گەردووندا دەژین؟
_ دەشتوانین بڵێین لە ئاسماندا دەژین، بەڵام هەردووکیان پڕاوپڕ یەک مانایان هەیە.

سیسیلیا دیسانەوە خۆی بەسەر داردەستەکەیدا چەماندەوە و چاوی بڕیە بەفرەکە. وتی؛

_ پڕنهێنیە. هەر زۆر پڕنهێنیە.

پاش نەختێک کە سەری هەڵبڕی، ئاریل تەماشایەکی کرد و هەروەک ئەوەی بیەوێت بەربەرەکانێی بکات وتی؛

_ بەبڕوای من تێگەیشتن لەوە ئاسانە و شتێکی هێندە گران نیە.

سیسیلیا لەنائومێدی خۆیدا سەری بۆ ڕادەوەشاند و وتی؛

_ من هەمیشە بیرم لە ئاسمان کردۆتەوە و ویستوومە بزانم لە چ شوێنێکدایە. دوای ئەوە هیچ یەکێک لەو ئەستێرەناسانەی کە سەفەری ئاسمانیان کردووە، نە خوای دیوە و نە فریشتە.

_ بەڵام هیچ پزیشکێکی مێشکیش تاکە ئەندێشەیەکی نەدیوە. هیچ توێژەرەوەیەکی خەویش نەیتوانیوە تەنانەت یەک خەونی کەسێکی تر ببینێت. بەڵام ئەوە مانای ئەوە نابەخشێت کە بیرکردنەوە و خەون لەناو سەری مرۆڤدا بوونیان نیە.

_ بێگومان نەء..

_ بەڕاست.. ئەو کاتەی کە خەوت دەبینی، هیچ کەسێکی ئەو قەراغ دەریا گەورەیە نەیدەتوانی تۆ ببینێت. ئێ خۆ چەندەها جار لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد.

_ تۆ دەتەوێت بڵێیت کە گەردوون پڕە لە فریشتە؟

_ بەڵێ هەر واشە. ئێ خۆ تۆ لەو بڕوایەدا نیت کە خودا گەردوونێکی هێندە فراوانی هەروا بێ هۆ خوڵقاندبێت؟ هەر بەهۆی ئەوەشەوە کە نە سەرمامان دەبێت و نە دەشسوتێین، دەتوانین لەسەر تەواوی هەموو ئەستێرەکاندا ببین. هەر تەنها لەسەر زەویە کە سەرما و گەرمای گونجاو هەیە و مرۆڤی لە لەش و خوێن پێکهاتوو تیایدا دەژی، دەنا لە هەموو شوێنەکانی تردا یان هەر زۆر ساردە یان هەر زۆر زۆر گەرمە. ئەگەر ئەم زەویە کەمێک لە خۆرەوە نزیکتر بوایە، ئەو کاتە لەش و خوێنی مرۆڤ بە هیچ جۆرێک بەرگەی نەدەگرد. وە ئەگەریش کەمێک بەلای 'پلۆتۆ'دا بوایە، ئەو کاتە یەکسەر لەشتان دەیبەست و دەبوونە پەیکەرێکی بەفرین.

فریشتەکە کەرەتێک بە ئاسماندا خۆی سوڕاندەوە و بەڵام هەرزوو دیسانەوە لەبەردەمی سیسیلیادا بە بەرزایی نیومەترێک لە زەویەوە وەستایەوە. سیسیلیا پرسی؛
_ تۆ قەت چوویتەتە سەر مانگ؟
_ من سەمای بالێت لەوێ دەکەم.
_ لەسەر مانگ؟
سەری بۆ لەقاند؛
_ هەر زۆر خۆشبوو ئەو کاتەی کە یەکەمجار مرۆڤ گەیشتە ئەوێ. ئێمە کۆمەڵێک فریشتەی زۆر بووین و لەوێدابووین. بەڵام نە 'ئارمسترۆنگ' و نە ئەوانی تریش دەیانتوانی بمانبینن. ئەوان وایان دەزانی هەر خۆیان بەتەنها لەوێدان. زۆر شانازیان بە خۆیانەوە دەکرد، چونکە وایان دەزانی یەکەمین کەسن کە پێیان نابێتە سەر مانگ.. تۆ دەزانیت ئارمسترۆنگ لەو کاتەدا کە لە کەشتیەکەی هاتەدەرەوە وتی چی؟
سیسیلیا لەوەڵامدا وتی؛
_ 'ئەمە هەنگاوێکی بچکۆلەی منە، بەڵام ئەم هەنگاوە هەنگاوێکی گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی'
_ کتومت وای وت!
سیسیلیا کەمێک دڵی بە مرۆڤایەتی دەسوتا، چونکە ئەو کاتەی کە وایان زانیبوو بەتەنها لەسەر مانگن، فریشتەکان بەدزیەوە سەیریان کردبوون. وتی؛
_ حەزدەکەم دەربارەی ئەوە لە رۆژنامەیەکدا شتێک بنوسم و بڵێم؛ 'دواهەمین هەواڵ؛ سەر مانگ پڕە لە فریشتە. ڕادارێکی نوێ، نهێنیەکی کۆن دەردەخات'.
ئاریل پێکەنی و وتی؛
_ بەڵام ڕەنگە دەربارەی 'ئەستیرۆد'ەکانت نەبیستبێت؟
سیسیلیا گەشایەوە، چونکە شارەزایی لەو بابەتەدا هەبوو. ئەو لەچاو زۆربەی هاوتەمەنەکانیدا، زۆرترین بابەتی دەربارەی گەردوون

خوێندبووەوە. لەسەرەتای نەخۆشیەکەیدا یەک بەدوای یەکی دەستەی گۆڤارە زانستیەکانی بەوردی خوێندبووەوە. سیسیلیا وتی؛
_ بێگومان دەربارەیانم بیستووە.. 'ئەستیرۆد'ەکان کۆمەڵێک ئەستێرەی زۆر بچوکن و لە خولگەیەکدا بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە. بەڵام چونکە زۆر زۆرن و زۆر بچکۆلەشن، هێشتا هەموویان بەتەواوەتی ناویان نەنراوە. زۆربەیان تەنها بەژمارە پێناسەدەکرێن.
ئاریل چەپڵەیەکی بۆ لێدا؛
_ ئافەرم! کەواتە زانیاریەکی زۆرت دەربارەی شتە قەشەنگەکانی ئاسمان هەیە، بگرە زۆر زیاتر لەوەی کە خۆت مەزەنەی دەکەیت. هەر کاتێک بمەوێت بە تەنها بم (بۆ نمونە بۆ ماوەی پەنجا ساڵێک یان سەد ساڵێک) دەچمە سەر 'ئەستیرۆد'ێکی بچکۆلە. ڕاستە ژمارەی فریشتەکانی ئاسمان زۆرن، بەڵام ژمارەی 'ئەستیرۆد'ەکان لە فریشتەکان زیاترێکن. سەفەرکردن لەسەر ئەستێرەیەکی بچکۆلەی ئاوها لە ڕادەبەدەر ئارامی دەبەخشێت، بەتایبەتیش لەپاش کۆبونەوەیەکی گەورە و مشتومڕێکی فریشتانەی گەرموگوڕ. هەندێ جار لەخۆشیدا لەسەر 'ئەستیرۆد'ێکەوە بۆ دانەیەکی تر خۆم هەڵدەدەم. هەتا بڵێیت خۆشە!
سیسیلیا پێی وابوو زۆر بەئاسانی باسی بکات، وتی؛
_ وابزانم درۆ دەکەیت.
ئینجا سەری هەڵبڕی و تەماشایەکی چاوە شینە یاقوتیەکانی کرد، بەڵام بەپەلە نیگای لەسەر لابرد، چونکە تۆمەتێکی گەورەی دایە پاڵی.
ئاریل وتی؛
_ بەداخەوە.. هیچ فریشتەیەک درۆ ناکات، بەڵام تۆ باوەڕ بەوە ناهێنیت کە من فریشتەم.
سیسیلیا بە دەنگێکی کەمێک ڕەنجاوەوە وتی؛
_ باشە.. باسی زیاترم بۆ بکە.
ئاریل وتی؛

_ خۆشترین شت بەلامەوە ئەوەیە کە سواری ئەستێرەیەکی کلکدار ببم.
_ سواری ئەستێرەیەکی کلکدار ببیت؟
_ بەڵێ، هەر بۆ نمونە ئەستێرەی کلکداری 'هاللی'. ئەو ئەستێرە کلکدارە 76 ساڵی پێدەچێت هەتا کەرەتێک بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە. بەلاَم خولگەکەی دەچێتە قولایی گەردوونەوە و هەر زۆر خێراتێدەپەڕێت. ڕەنگە سواربوونی ئەستێرەیەکی کلکدار لەگەڵ سواربوونی خلیسکێنەیەکدا بەراوردبکرێت، کە لە سەری دادەنیشیت و دەخلیسکێیتە خوارەوە. تەنها جیاوازی لەوەدایە کە پێویست ناکات کەرەتێکی تر بچیتەوە سەرەوە بۆ ئەوەی دیسانەوە خلیسکێنە بکەیتەوە.
سیسیلیا سەری بۆ ڕاوەشاند؛
_ شتێکی خراپ نیە. بگرە خۆشم پێمخۆشدەبوو سواری شتێکی ئاوها بوومایە، بەلاَم بەڕاستی نەمزانیبوو کە فریشتەکان هێندە حەزیان لە یاریە.
'ئاریل'ی فریشتە تەماشای ناوچای سیسیلیای کرد و وتی؛
_ من وتم خوا ئادەم و حەوای بۆ ئەوە خوڵقاند تا کەسێک هەبێت لە نێوان درەختەکاندا ڕابکات و لەو باخە گەورەیەدا چاوشارکێ بکات. ئاخر هیچ حیکمەتێکی تێدا نەدەبوو گەر باخچەیەکی گەورە بخوڵقێنێت و هیچ منداڵێک یاری تێدا نەکات.
سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند و 'ئاریل'یش بەردەوامبوو؛
_ هیچ حیکمەتیکیش لەوەدا نەدەبوو کە گەردوونێکی فراونت هەبێت کە میلیاردەها ئەستێرە و هەسارە و مانگ و 'ئەستیرۆد'ی تێدا بێت و هیچ فریشتەیەکی تێدا نەبێت کە بەکاریان بهێنێت.
سیسیلیا پشتگیری قسەکانی کرد و وتی؛
_ پێم وابێت قسەکانت تاڕادەیەک بەجێیە. بەلاَم تەنانەت وشەیەکیش لەو شتانەی کە باستکردن، بەهیچ شێوەیەک لە چیرۆکەکانی ئینجیلدا نەهاتووە.

ئاریل وەڵامی ئەوەی نەدایەوە و لەبری ئەوە شتێکی تەواو جیاوازی باسکرد و وتی؛

_ ئەگەر خوا هەموو شتێکی تەنها لەبەرئەوە بخولقاندایە کە هێزی مەزنی خۆی نیشانبدایە، ئەو کاتە لەڕادەبەدەر خۆپەرستدەبوو. نزیکەی سەد ملیارد گەلەهەسارە (مەجەرە) لە گەردووندا هەیە و لە هەر دانەیەکدا نزیکەی سەد ملیارد خۆری تێدایە. ئیتر خۆت بزانە چەندە ئەستێرە و مانگ هەیە (ئەوە واز لە ژمارەی 'ئەستیرۆد'ەکانیش بهێنە). ڕاستە ژمارەی فریشتەکانی ئاسمانیش زۆرن، بەڵام ناتوانین ڕاستەوڕاست گلەیی بکەین و بڵێین شوێنمان کەمە و ناتوانین بەئارەزوی خۆمان بجوڵێینەوە. هاوکاتیش ناتوانین گلەیی لەوە بکەین کە کاتمان کەمە.

_ بێگومان نەء.. پیرۆزتان بێت!

_ سیسیلیا، ئێمەین کە گەردوون پێکەوە دەبەستینەوە. خودا قەت داڵی گەورەی لەسەر شان نەبووە، بەڵام هەمیشە ڕەوەیەک فریشتەی زۆری هەبووە.

سیسیلیا بە یەکێک لە داردەستەکانی بەفرەکەی هەڵدەکۆڵی و وتی؛

_ ئەگەر تۆ کتێبێکت دەربارەی ئەو هەموو شتانە بنوسیبایە، ڕەنگە خەڵاتێک یان دوو خەڵاتی نۆبڵت وەربگرتایە.

_ بۆ دوو خەڵات؟

_ خەڵاتێک لە 'تیۆلۆجی'دا و خەڵاتێکیش لە ئەستێرەناسیدا. هەڵبەتە ئەگەر هەردوو بابەتەکەیان پێکەوە گرێنەدایە. یان هەر هیچ نەبێت بواری ئەوەت دەبوو خەڵاتی نۆبڵت لە فەنتازیادا وەربگرتایە. بەڕاستی هەقی خۆت بوو.

ئاریل پێکەنی؛

_ بەهەرحاڵ من نامەوێت بەربەرەکانێی چەند کەسانێکی جدیی زانست بکەم. ئەوان لەو بڕوایەدان هەموو نهێنیەکانی سروشت لە ڕێگەی مایکرۆسکۆپ و تەلیسکۆبەوە دەربخرێت. هەروەها تەنها باوەڕیان بەو شتانەیە کە شیاوی کێشان و ئەندازەن. بەڵام ئەوان تەنها بەش بەش لە شتەکان تێدەگەن. لەوە تێناگەن کە هەموو شتێک

لە ئاوێنەیەکدا دەبینن، هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینن. ئێ خۆ فریشتە نە دەکێشرێت و نە ئەندازەشی دەگیرێت، کەس ناتوانێت ئەوە بکات. هیچ سودێکیشی نیە گەر زۆر بەوردی لە ئاوێنەیەک بکۆڵینەوە، چونکە ئاکامەکەی هەر ئەوەندە دەبێت کە وێنەی خۆمان ڕونترێک دەبینین و هیچی تر. لەبەرئەوە باشترێکە گەر کەمێک فەنتازیا بەکاربهێنین.

سیسیلیا وردەوردە خێراتر لە بەفرەکەی بەردەمی هەڵدەکەنی، وتی؛

_ منیش حەزمدەکرد لە 'ئەستیرۆد'ێکەوە بۆ سەر یەکێکی تر بازمبدایە. منیش پێم خۆشدەبوو گەر لەسەر مانگ سەمای بالێتم بکردبایە، یان بچوومایەتە سەر ئەستێرەیەکی کلکداری خۆش و بە ناو گەردووندا بفریمایە. چونکە هەموو شتێک لە گەردووندایە، تۆ دەڵێیت...

_ چی؟

_ خەڵکانێکی زۆر پێیان وایە لە پاش مردن بچینە ئاسمان، باشە دەچینە ئاسمان یان ناچین؟

ئاریل هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا؛

_ ئێوە ئێستاکە لە ئاسماندان. ڕێک لەم کاتەدا ئێوە لێرەدان. لەبەرئەوە بەبڕوای من باشترە واز لە شەڕ و لێدانی یەکتری بهێنن. چونکە ڕەفتارێکی پەسەند نیە کە ڕێک لەبەردەم چاوی خوادا شەڕبکەن.

_ وەڵامی پرسیارەکەمت نەدایەوە.

_ ئێوە دێن و دەڕۆن، بەڕێگەی خۆتاندا دەڕۆن و دێن. ئەستێرەکان و هەسارەکانیش هەمان شت دەکەن.

_ وایە، وایە، وایە!

سیسیلیا یەکێک لە دار دەستەکانی لە زەویەکە چەقاند.

_ تورەبوویت سیسیلیا؟

سیسیلیا دەیزانی کە فریشتەکە ڕاستدەکات، بەڵام پێی وابوو هەقی خۆیەتی گەر لەوێدا کەمێک تورەبێت. وتی؛

_ تۆ بەردەوام باسی ئەوەتکرد کە مرۆڤ لە لەش و خوێن پێکهاتووە و وتت هیچ شتێک کە لە لەش و خوێن پێکهاتبێت ژیانێکی هەتاهەتایی نیە. ئەوەش بەلای منەوە شتێکی ناخۆشە، چونکە منیش حەزمدەکرد بەر لەوەی یەک دوو ملیارد ساڵێک بۆ پشوو بچمە سەر ئەستێرەیەکی خۆشی گەلەهەسارەیەکی دور، بۆ ماوەی چەند هەزار ساڵێک لە نێوان 'ئەستیرۆد'ەکاندا بازبازۆکێم بکردایە. لەبەرئەوە زۆر بیر لە ژیانی هەتاهەتایی دەکەمەوە و دەڵێم بڵێت ژیانێکی ئاوهامان هەبێت؟

سیسیلیا دەستی بەدەمیەوە گرت.. ئەو هەموو وشانەی لە کوێوە بۆ هات؟

ئاریل وتی؛

_ هیچ کەسێک 'ژیانی هەتاهەتایی' نیە، بەلایەنی کەمەوە فریشتەکانی ئاسمان ئەو جۆرە ژیانەیان نیە. چونکە فریشتەکان 'ناژین'، لەبەرئەوە بەهیچ شێوەیەک هەست بە هیچ ناکەین، هەر لەبەرئەوەشە کە قەت گەورە نابین. ئێ خۆ لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد.

سیسیلیا سەیری بەفرەکەی بەردەمی دەکرد؛

_ وابزانم کەمێک ناهەقییە گەر ئێوە گلەیی لەوەبکەن کە ناژین، بەتایبەتیش لە کاتێکدا کە بۆ هەتاهەتایە بۆ خۆتان لە نێوان ئەستێرە و هەسارەکاندا دێن و دەچن.

ئاریل وەڵامی دایەوە و وتی؛

_ هەروەک ئەوە وایە کە تۆ لە خەونتدا بچیتە سەر قەراغ ئاوێکی دور. بیر لەوە بکەرەوە گەر هەموو ژیانت تەنها خەونێک بوایە و هیچی تر!

سیسیلیا شانێکی بۆ هەڵتەکاند؛

_ ئەگەر ئەو خەونە بۆ هەتاهەتایە بەردەوام بوایە و خەونێکی خۆشیش بوایە، ئەو کاتە وابزانم ئەو خەونەم بەلاوە باشترێک دەبوو وەک لەم ژیانە. بەڕاست.. تۆ خۆت کامیانت بەلاوە باشترێکە؛ ژیانی مرۆڤێک بۆ ماوەی چەند ساڵێکی کەم یان ژیانی فریشتەیەک بۆ هەتاهەتایە؟

_ نە من و نە تۆ هەڵبژاردنێکی ئاوهامان لەبەردەستدایە. لەبەرئەوە ئەوە ناهێنێت کە باسی بکەین. خۆ ڕەنگە وا باشتربێت کە یەک کەرەت بواری ئەوەت هەبێت کە تەماشای گەردوون بکەیت وەک لەوەی بەهیچ شێوەیەک ئەو بوارەت لەبەردەستدا نەبێت. ئێ خۆ ئەوانەی کە هێشتا نەخولقێنراون، هەقی ئەوەیان نیە کە داوای ئەوە بکەن کە بخولقێنرێن.

سیسیلیا بەقوڵی بیری لە دوا وشەکانی ئاریل کردەوە. ئینجا کەرەتیکی تریش بیری لیکردنەوە و دواتر وتی؛

_ بەڵام لەوانەیە وای بەباشبزانن کە هەر لەدایک نەبن وەک لەوەی بۆ ماوەیەکی کورت بژین. ئێ خۆ ئەگەر لەدایک نەبن، ئەو کاتە نازانن چ شتێکیان لەکیس دەچێت.

ئاریل وەڵامی نەدایەوە. لەناکاودا بە ئاسماندا بەرزبووە و تەماشای ماڵی سیسیلیای کرد لە خوارەوە. وتی؛

_ سەعات سێیە. با بەرلەوەی خەبەریان ببێتەوە، بەپەلە بگەڕێینەوە.

سیسیلیا بەسەر گردەکاندا هاتە خوارەوە. 'ئاریل'یش بەتەنیشتیەوە بەئاسماندا دەفڕی. هیچ کێشەیەکیش نەبوو کە بەنێوان دارە چڕەکاندا دەڕۆیشتن، چونکە سیسیلیا دەیتوانی بە پێڵاوی خلیسکێنەکەیەوە بەنێوانیاندا تێپەڕێت و 'ئاریل'یش بەناو قەدی درەختەکاندا بڕوات، هەر دەتوت چەند پایەیەکن و لە تەم دروستکراون. پاش نەختێک بەسەر دوا لێژاییدا سەرکەوتن بەرەوڕوی ئەمبارەکە.

ئاریل کڵاوی قەمسەڵەکەی سیسیلیای گرت و وتی؛

_ بەبێ ئەوەی بمانبینن، فریا ناکەوین بچینە سەرەوە.

_ فریا ناکەوین؟

ئاریل فریانەکەوت وەڵامی بداتەوە. بەتوندی دەستی دایە قەمسەڵەکەی سیسیلیا و بەرزیکردەوە بۆ ئاسمان. چرکەی دوای ئەوە لەپەنجەرە داخراوەکەوە چوونە ژورەوە و لەناوەڕاستی ژورەکەی سیسیلیادا وەستانەوە.

نە پەنجەرەکە هیچی لێهات و نە سیسیلیاش، بەڵام هێشتا پێڵاوی خلیسکێنەکانی هەر لە پێدابوو. نەختە نەختە ئاو لە پێڵاوەکانیەوە دەچۆڕایەوە سەر عەرزەکە.

سیسیلیا بەشەرمەوە ئاماژەی بۆ پێڵاوەکان و عەرزەکە کرد و بە چرپەیەک وتی؛

_ ئاخۆ کە ئەمە ببینن چی بڵێن؟

ئاریل لە وەڵامدا وتی؛

_ من هەمووی دەسڕم.

سیسیلیا بەپەلە پێڵاوەکان و جلەکانی داکەند، جلی خەوی لەبەرکرد و خۆی خنیە ناو جێگای خەوەکەیەوە. چاوی لێبوو کە ئاریل زۆر بەخێرایی جلەکانی بەجوانی قەد دەکرد و دەیخستنەوە ناو کەنتۆرەکە. پێڵاوی خلیسکێنەکە و داردەستەکانی بە دیوارەکەوە هەڵسپاردەوە. ئینجا چەند جارێک فوی لە پێڵاوەکان و عەرزەکە کرد و تەواوی ئاو و بەفرەکە دیارنەمان. دوای ئەوە چیتر مەحاڵبوو بزانیت کە سیسیلیا لەبەر تریفەی مانگەشەوی دەرەوەدا بووە.

_ هەر زۆر باشە..

سیسیلیا هێندەی وت و ئیتر خەوی لێکەوت.



کەچاویکردەوە، باوکی لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەیەوە دانیشتبوو. سیسیلیا لێی پرسی؛
_ سەعات چەندە؟
_ حەوتە.
دەمێکە لێرەدا دانیشتوویت؟
_ وا چەند سەعاتێکە..
ئینجا خلیسکێنەی سەربەفرەکەی دوێنێ شەوی بیرکەوتەوە. پێڵاوەکانی هیچی پێوە نەبوو و کەس نەیدەزانی کە بەکاری هێناون. خۆ ڕەنگە دوێنێ شەویش نەبووبێت. لەوانەیە چەندەها شەوی بەسەردا تێپەڕیبێت، ئێ سیسیلیا لە کوێوە بزانێت.
ئەمڕۆ لەچاو ڕۆژانی پێشوویدا زۆر زیاترێک هەستی بە لاوازیدەکرد. بڵێیت خەتای خلیسکێنەکەی سەر بەفرەکەبێت کە لەگەڵ 'ئاریل'دا کردی؟
سیسیلیا وتی؛
_ وابزانم ئەمڕۆ زۆر باش نیم.
باوکی دەستیگرت و وتی؛
_ وایە دیارە.
_ ئەمڕۆ چەندی مانگە؟
تەماشایەکی سەعاتەکەی کرد و وتی؛
_ 22ی مانگی یەکە.
_ واتە نزیکەی مانگێک بەسەر جەژنی لەدایکبوونی مەسیحدا تێپەڕیووە.
باوکی سەری بۆ لەقاند؛
_ پاش نەختێک دایکت بەخۆی و دەرزیەکەتەوە دێتە لات.

_ "دەرزی.."
_ بەڵێ، وا لە حەمامەکەیە.
_ بەڕاستی لە هەموو شتێک بێزارم.
دەستی گوشی و وتی؛
_ بێگومان لە هەموو شتێک بێزاریت.
سیسیلیا ویستی سەر هەڵببڕێت و تەماشای بکات؛
_ دەمەوێت کە گەورەبووم ئەستێرەناسی بخوێنم.
_ ئەوە.. هەر زۆرزۆر سەرنجڕاکێشە.
_ هەردەبێت ڕۆژێک لە ڕۆژان کەسێک هەموو شتەکان بدۆزێتەوە.
_ مەبەستت چیە؟
_ بابە، منم کە نەخۆشم..
_ وایە، ڕاستە.
_ ... بەڵام ئێوەن کە بە ئاگا نین. مەبەستم لەوەیە دەبێت کەسێک نهێنی بوونی هەموو شتەکان دەربخات. ئێ خۆ ناکرێت هەتاهەتایە هەر ئاوها بمێنێتەوە.
_ زانستی ئەمرۆکە کەمێک زیاتر دەزانێت..
_ بەبڕوای تۆ فریشتە هەیە؟
_ بۆچی بیر لەوە دەکەیتەوە؟
_ ئەی بەبڕوای تۆ خوا هەیە؟
سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ وابزانم تۆش بڕوات پێیەتی؟
_ نازانم.. خۆزگە هێندە دڵی ڕەق نەبوایە. تۆ دەزانی خوا فریشتە لەسەر شتێکی نایابی وەک 'ئەستیرۆد' دادەنێ؟ خۆ ئەگەر فریشتەکان ئارەزویان لێبێت، ئەوا دەتوانن بۆ هەتاهەتایە لەوێدا بمێننەوە و بۆ خۆیان ڕاببوێرن. هیچ پێویستیان بەوەش نیە کە نینۆکیان بکەن، یان دانیان بشۆن. هەندێ فریشتەی تر لەسەر ئەستێرەیەکی کلکدار دادەنیشن و بەخێراییەکی یەکجار زۆر بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە. ئینجا لەوێوە سەیرێکی زەوی دەکەن و هەر زۆر پەرۆشی ئەوەن بزانن مرۆڤی وەک ئێمە بە چ شێوەیەک دەژی..

_ وابزانم ئەمانە هەمووی فەنتازیای خۆتن.
_ ..هاوکاتیش خوای مەزن بەئیسراحەتی خۆی پاڵی لێداوەتەوە و وەکو بڵقی سابوون فوو بە ئێمەدا دەکات. بەس بۆ ئەوەی خۆی نیشانی فریشتەکانی ئاسمان بدات.
_ بێگومان شتی وا ناکات.
_ چۆنە ئاوها دڵنیایت؟ کێ دەڵێت کە لەڕادەبەدەر خۆی بەزل نازانێت؟
_ سیسیلیا، ئێمە لە هەموو شتێک تێناگەین.
_ ئەوەم لەوەوپێش گوێ لێبووە.. ئێمە بەش بەش لە شتەکان تێدەگەین. ئێمە هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکەوە دەبینین، هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینین.
_ وایە، ئەو وشانەت پڕمانان و زیرەکانەن.
سیسیلیا بە سیمایەکی نائومێدەوە تەماشایەکی باوکی کرد.
ماوەیەکی زۆر تێپەڕی. حەزیدەکرد شتی تریش بڵێت، بەڵام خۆشی نەیدەزانی کە تاقەتی هەیە یان نا. هەر لەوە دەچوو بەو ئومێدەوەبێت کە باوکی وشەکان لە مێشکیەوە بهێنێتە دەرەوە و پێویست نەکات دەمی بکاتەوە.
سیسیلیا وتی؛
_ سەفەرەکەی کریتا'ت لە یادە؟
باوکی سوکە خەندەیەک گرتی؛
_ چۆن ئەوەم بیردەچێتەوە؟
_ هەی خەوتوو.. مەبەستم لەوەیە ناو فڕۆکەکەت لەبیرە یان نا؟
سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ هەموویم لەیادە، تەنانەت بیرمە لەم سەرەوە کە ڕۆیشتین لەناو فڕۆکەکەدا زەڵاتەی پەتاتەتە و مریشیان بۆ هێنا ین و لەو سەریشەوە کە گەڕاینەوە ماڵەوە شفتەی بەراز و شلەی بیبەری سوریان بۆ هێنا ین..
_ باسی خواردنم بۆ مەکە بابە. مەبەستم لەوەیە من لە پەنجەرەکەوە تەماشای خوارەوەم دەکرد. تەماشای زەویم دەکرد.

سیسیلیا لەوەندە زیاتری نەگوت. بەڵام بیری لەوە دەکردەوە کە لە فڕۆکەکەدا دانیشتبوو و لە ئاسمانەوە تەماشای زەوی دەکرد، سەیری شارەکان و ڕێگاکان و چیاکان و پارچە زەویەکانی خوارەوەی دەکرد. لەڕێگایاندا بەرەو ماڵەوە لەپێشدا بەسەر هەورەکاندا فرین. هەروەک ئەوە وابوو کە خۆی لە نێوان زەوی و ئاسماندا بێت. شەوێکی درەنگ ئەوجا گەیشتنەوە نەرویج. لەکاتی فرینیاندا بەرەو فڕۆکەخانەی ئۆسلۆ بەناو هەورەکاندا هاتنەخوارەوە، کە هەر لە لۆکەی سەرداری جەژنی لەدایک بوونی مەسیح دەچوون. ئیدی لەوێوە چەشنە وڵاتێکی خەیاڵی دەرکەوت و پڕبوو لە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ.

سیسیلیا وتی؛

_ لەگەڵ لەدایکبوونماندا هەموو جیهان بەدیاری وەردەگرین.

باوکی سەری بۆ لەقاند. لەوە دەچوو حەزی لەوە نەبێت کە سیسیلیا باسێکی زۆری لابوو و دەیویست هەڵیانبرێژێت.

_ بەڵام هەر ئەوەندە نیە کە ئێمە دێینە ناو جیهانەوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین جیهانیش دێتە ناومانەوە.

_ ئێ خۆ ئەوە تاڕادەیەک هەر هەمان شتە.

_ بابە، هەستدەکەم هەموو جیهان هی من بێت.

باوکی دەستەکەی تریشی گرت؛

_ بەشێوەیەک لە شێوەکانیش هەر وایە.

_ مەبەستم هەر لەم خانوە نیە.. یان 'ڕاونەکۆلن'.. و ڕوبارەکەی خوارەوە. من خاوەنی کەمێک لە دەشتی 'لاسیتی'ی 'کریتا'شم.. هەروەها خاوەنی هەموو دورگەی 'سانتۆرینی'شم. هەر ڕێک وەک ئەوە وایە کە کاتی خۆی لە قەڵا دێرینەکەی 'کنۆسۆس'دا ژیابم. من خاوەنی مانگ و خۆر و هەموو ئەستێرەکانی ئاسمانم، چونکە هەر هەموویانم بینیوە.

باوکی دەستیدایە زەنگی سەر مێزی تەنیشت جێگاکە و زەنگێکی لێدا. بەڵام بۆ؟ بڵێیت ئەویش نەخۆش کەوتبێت؟

سیسیلیا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛

_ کەس ناتوانێت هیچ شتێک لەوانەم لێبسەنێت. هەمیشە وەک جیهانی من دەمێنێتەوە. بۆ هەتاهەتایە وەک جیهانی من دەمێنێتەوە.
لەوێدا دایکی خۆیکرد بە ژورەکەدا. باوکی لەسەر کورسیەکە هەستا و بەپەلە چووە دەرەوە. دەمێکبوو لەلای دانیشتبوو و بێگومان پێویستی بە سەردانی تەوالێت بوو.
_ سیسیلیا؟
سیسیلیا ڕوی وەرچەرخاندە دایکی و بەنیگایەکی پڕ لە گلەییەوە تەماشایکرد؛
_ سیسیلیا!
_ دایە، ناتوانیت یەکسەر دەرزیەکەم لێبدەیت؟ بەڕاستی پێویست ناکات سەعاتێک باسی هەزارویەک شت بکەین.
یەکسەر دەرزیەکەی لێدا و خەوی لێکەوت. پاشتر کە چاوی کردەوە ئاریل لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەیدا دانیشتبوو.
ڕاستەوڕاست هەستیدەکرد زۆر باشتربێت وەک لەو کاتەی کە دایک و باوکی لەلای دانیشتبوون. لەوەدەچوو هەر بوونی لەگەڵ فریشتەکەدا نەخۆشیەکەی کەمتربکردایەتەوە..
ئاریل لێی پرسی؛
_ باش خەوتیت؟
لەسەر جێگاکەی بەرزبووەوە و لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشت، سەیرێکی پەنجەرەکەی کرد، دونیا ڕوناک بووبوەوە.
وتی؛
_ ئەوە خۆ ڕۆژە. جارجارێک بەتەواوەتی سەرم لێدەشێوێت.
ئاریل بەشێوەیەکی پڕ لە نهێنی سەرێکی بۆ لەقاند و وتی؛
_ زەوی بەردەوام هەر دەخولێتەوە و هەر دەخولێتەوە.
سیسیلیا پێکەنی. خۆشی نەیدەزانی بۆ پێدەکەنێت، بەڵام ڕێک لەوێدا بەلایەوە سەیربوو کە زەوی بەردەوام دەخولێتەوە. وتی؛
_ نازانم چ کەسێک بوو کە کاتی خۆی وتی ژیان تەختەی شانۆیەکە. کەواتە دەبێت شانۆیەک بێت کە بخولێتەوە.
ئاریل بە دەنگێکی پڕ لەدڵنیاییەوە وتی؛

_ بێگومان. بەڵام ڕەنگە تۆ نەزانیت بۆ ئاوهایە؟
سیسیلیا شانێکی بۆ هەڵتەکاند.
_ هیچ گرنگیەکی نیە، چونکە من هەستی پێناکەم کە دەخولێتەوە. من خۆم پێم خۆشتربوو کەمێک وەک یاری کورسی کورسی بجولایەتەوە. ئەگەر وابوایە.. ئەو کاتە هەموو یاری کورسی کورسیەکانی جیهان ڕەواجیان نەدەما.
ئاریل لەسەر کورسیەکە بەرزبووەوە و بە هێواشی بەناو ژورەکەدا فڕی و لەسەر مێزی نوسینەکە بۆی دانیشت. تەماشایەکی سیسیلیای کرد و وتی؛
_ زەوی بۆیە دەخولێتەوە، بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤێک بتوانێت لە هەموو ئاڕاستەیەکەوە تەماشای گەردوون بکات. بەو شێوەیەش لەهەر شوێنێکی ئەم جیهانەدابن، تائەندازەیەک هەموو ئەستێرەکان و شتەکانی ئاسمان دەبینن.
_ من قەت لەوەوپێش خەیاڵم بۆ ئەوە نەچووبوو.
ئاریل زۆر بەگرنگیەوە سەری بۆلەقاند و لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو؛
_ چ ئەوەی ئێوە لە 'یاسهایم' بژین یان لە 'جافا' بژین، نابێت بچوکترین بەشی ئاسماننتان لێبشاردرێتەوە. هەر لەڕادەبەدەر ناهەقی دەبوو ئەگەر تیشکی خۆر نەیدایە لە دەموچاوی نیوەی مرۆڤەکانی سەر زەوی. یان بۆ نمونە ئەگەر نیوەی مرۆڤایەتی قەت بواری ئەوەی نەبوایە تەنانەت نیوە مانگێکیش ببینێت. بەڵام خۆر و مانگ هی هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوین.
_ بەڕاستی هەر لەبەرئەوە بووە کە کاتی خۆی خودا ئەو سوڕانەوەیەی دەستپێکردووە؟
_ بەڵێ! بەڵام هەر تەنها لەبەرئەوەش نەبوو..
_ کەواتە زیاترێکم بۆ باسبکە.
_ لەبەرئەوەش بوو کە هەموو فریشتەکان بواری ئەوەیان هەبێت کە زەوی ببینن، ئیتر لەسەر هەر تەنێکی ئاسمانی بن. بەڕاستی هەر زۆر

ئاسانترە ئاگاداری زەویەک بیت کە بخولێتەوە وەک لەوەی ئاگاداری زەویەک بیت کە یەک ڕوی لێت بێت.
سیسیلیا هەستیدەکرد 'ئاریل'ی فریشتە زۆر بە پەرۆشبوو، هەر قسەیدەکرد و قسەیدەکرد. لەوێدا لەگەڵ قسەکانیدا قاچەکانیشی دەلەراندەوە.
ئاریل وتی؛
_ وابزانم لەوەوپێش پێم وتیت کە ئێمە دەتوانین ناوەوەی شتەکان ببینین، بەلاّم پێم وابێت هێندەم پێ نەگوتیت کە ئێمە دەتوانین لە دوریشەوە شتەکان ببینین.
_ مەبەستت لەوەیە کە هەرچەندە لەسەر ئەستێرەیەکی بێمانای ناو قولاّیی گەردونیشدابن، دەتوانن لەو سەرەوە مرۆڤەکانی سەر زەوی ببینن؟
_ بەڵێ ڕێک مەبەستم لەوەیە. ئێ خۆ لەو سەرەوە هێندە شتی زۆر ڕونادات. بەلاّم کاتێک کە لەسەر ئەستێرەیەکی بێمانا بەباشی بۆی دادەنیشین و تەماشای گۆی زەویدەکەین لەسەرەوە، دەتوانین ئاگامان لە شانۆی ئاسمانی بێت، ئیتر ئەگەر بەشەکانی ئەو شانۆیە لە دورگەی 'کریتا'دا ڕوبدات یان لە 'کلیوفتە'دا هیچ جیاوازیەکی نیە.
_ 'شانۆی ئاسمانی'؟
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند؛
_ مەبەستم لە گۆی زەویە، سیسیلیا. ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە هەروەک شانۆیەکی بێکۆتایی وایە. ئێوە دێن و دەڕۆن. بەڕیزی دورودرێژ...
سیسیلیا بۆ ماوەی چەند چرکەیەکی کەم لەسەر قەراغی جێگاکە دانیشتبوو و هیچ نەدەجولاّیەوە، ئینجا وتی؛
_ واتە هەر زۆر خراپە!
سیسیلیا لەقەیەکی توندی لە کورسیەکەدا.
_ ئەگەر بەڕاستی وابێت، ئەوا هەر زۆر زۆر ناهەقیە.
ئاریل کەمێک سەریسوڕما، بەلاّم هێشتا ئەوەندە نەشڵەژا کە قاچەکانی نەلەرێنێتەوە. وتی؛

_ کەواتە چیتر باسی ئەوە ناکەین.
_ نازانم، لەوەدەچێت ئیتر هەر تاقەتی قسەکردنیشم نەمابێت.
بۆ ماوەی چرکەیەک ئاریل قاچی وەستاند و وتی؛
_ تۆ نائومێد و تورەیت سیسیلیا.
_ ئینجا چیە؟
_ ئاخر هەر لەبەر ئەو نائومێدی و تورەییەتە کە من سەردانت دەکەم.
سیسیلیا چاوی بڕیبووە عەرزەکە.
_ هەرچەند دەکەم ناتوانم شێوازێکی تری ئافەراندنی ئەم جیهانە بدۆزمەوە و بڵێم دەکرا بەشێوەیەکی کەمێک جیاوازتر بوایە.
_ لەوەوپێش باسی ئەوەمان کرد. من دڵنیام کە چەندەها جار هەوڵتداوە وێنەی شتێک بەباشی بکێشیت، بەڵام دواتر کەمێک جیاوازتر دەرچووە و پڕاوپڕ وەک ئەو وێنەیە نەبووە کە لە خەیاڵتدا بووە..
_ ئێ تا ڕادەیەک بەردەوام ئەوە ڕوودەدات. هەر کتومت هەموو خۆشیەکەش لەوەدایە کە تۆ پڕاوپڕ نازانیت چی لێدەردەچێت.
_ کەواتە بەو شێوەیەش ڕاستەوڕاست دەسەڵاتێکی مەزنت بەسەر ئەو شتەدا نیە کە وێنەی دەکێشیت.
سیسیلیا وەڵامی نەدایەوە. پاش وەستانێکی دوورودرێژ ئەوجا وتی؛
_ ئەگەر من وێنەی شتێکم بکێشابایە و بمزانیبایە دواتر دەبێتە شتێکی زیندوو، ئەو کاتە نەمدەوێرا وێنەی هیچ شتێک بکێشم. قەت نەمدەوێرا ژیان بە شتێک ببەخشم کە نەتوانێت بەرەنگاری هەموو ڕەنگە پەرۆشەکانی تر ببێتەوە.
فریشتەکە شانی هەڵتەکاند؛
_ لەهەموو بارێکدا ئەو فیگورانەی کە وێنەت دەکێشان بەش بەش لە شتەکان تێدەگەیشتن. نەیاندەتوانی ڕوبەڕو شتەکان ببینن.
سیسیلیا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی؛
_ خەریکە هەموو نهێنیەکانت لە مێشکم دەدەن.
_ بەداخەوە، چونکە مەبەستەکە وا نەبوو.

_ نازانم چ کەسێکی بێئەقڵ کاتی خۆی وتبووی "گرنگترین شت ئەوەیە کە هەبیت یان نەبیت". بەڕاستی وا زیاتر و زۆرتر لەگەڵ ئەو پیاوەدا تەبادەبم کە ئەو قسەیەی کردووە، یان لەگەڵ ئەو ژنەدا.. تۆ خۆت وتت کە ڕەگەز و ئەو شتانە گرنگیەکی ئاوهای لە جیهانی ڕۆحانیەتدا نیە...

ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛

_ 'هەبوون یان نەبوون'، وتەیەکی بەجێیە، چونکە هیچ شتێک لەو نێوانەدا نیە.

_ مەبەستم لەوەیە کە ئێمە تەنها ئەم جارە لەسەر ئەم زەویە دەبین. هەرگیزا و هەرگیزیش کەرەتێکی تر ناگەڕێینەوە!

_ من دەزانم کە تۆ زۆر نەخۆشیت سیسیلیا..

سیسیلیا قسەکانی پێبڕی و وتی؛

_ بەڵام بۆت نیە بپرسیت چ نەخۆشیەکم هەیە. ڕێگە بە هیچ کەسێک نادەم باسی ئەوە بکات، تەنانەت بە فریشتەکانی ئاسمانیش.

_ دەمەویت بڵێم کە من تەنها بۆ ئەوە هاتووم کە دڵنەوایت بدەمەوە.

سیسیلیا بەدەم هەنسکەوە وتی؛

_ بۆ دڵنەوایی و گواستنەوەم هاتوویت!

ئاریل لەسەر مێزی نوسینەکە بەرزبووەوە و لەو کاتەدا کە پێکەوە قسەیان دەکرد، بەئاسمانی ژورەکەدا دەهات و دەچوو؛

سیسیلیا وتی؛

_ وابزانم کە پیربووم و مردم، دیسانەوە دەبمەوە بە منداڵ. ئەو کاتەش هەر ڕێک وەک ئێوە لە ئاسماندا دەژیم. ئەو کاتە هەموومان دەبینە شتێک لە بابەتی 'داڵەکانی ئۆدین'. بەڕاستی ئەوەش خۆشە.

ئاریل پرسی؛

_ تۆ لەو بڕوایەدایت؟

_ "تۆ لەو بڕوایەدایت؟".. "تۆ لەو بڕوایەدایت؟".. ئێ خۆ هەر هیچ نەبێت دەبێت تۆ ئەوەیان بزانیت!

ئاریل بە ئاسمانەوە لەبەردەمی جێگای خەوەکەدا پاڵکەوتبوو و لارەلاریدەکرد، بەو شێوەیەش سێبەرەکەی دەیدا لە ملوانکە مرواریە

كۆنەكە و سالۆمێرە یۆنانیەكەی كە وێنەی پشیلەكانی تێدا بوو. بەدەنگێكی دڵنیاوە وتی؛
_ نەخێر.. ئافەریدەی سەر زەوی و ئاسمان نهێنیەكی هێندە مەزنە كە نە مرۆڤی ئێرە لێی تێدەگات و نە فریشتەكانی ئاسمانیش.
_ كەواتە وەك ئەوە وایە لەگەڵ باوكمدا یان لەگەڵ نەنەكمدا باسی ئەم شتانە بكەم.
ئاریل سەرێكی بۆ لەقاند؛
_ بەڵێ چونكە ئەوانیش لەشوێنێك لە شوێنەكاندا هەر لەناو نهێنی گەورەی خوداداان.
سیسیلیا سەری هەڵبڕی و تەماشایەكی كرد؛
_ تۆ خوات بینیوە؟ مەبەستم لەوەیە ئاوها دوو بەدوو چاوت پێكەوتووە؟
_ لەكاتی ئا ئێستادا ڕوو بەڕوو لەگەڵ بەشێكی بچكۆلەی خوادا دانیشتووم. چونكە هەموو وشەیەك كە لەگەڵ بەشێكی بچكۆلەی ئەودا باسم كردووە، لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەودا باسمكردووە.
سیسیلیا باش بیریكردەوە و ئینجا وتی؛
_ ئەگەر تەنها بەو شێوەیە خودا ببینیت، ئەو كاتە كەمێك سەختە تەختی عەرزی بكەین.
ئاریل ناچاربوو پێبكەنێت؛
_ ئێ ئەو كاتە هەر خۆی لە خۆی دەدات.
بۆ ماوەیەك بێدەنگیەكی تەواو ژورەكەی گرتەوە، دواتر ئاریل دەستی بە قسەكردەوە و وتی؛
_ تۆ گلەیی دەكەیت و دەڵێیت خوا بێئەقڵە، بەڵام ڕەنگە لەو كاتەدا خودا خۆی بێت كە خۆی بەو وشەیە تاوانبار دەكات. یان ئەو قسەیەت لەبیرنیە كە لەو كاتەدا وتی كە بە خاچەكەوە هەڵیانواسی؟
سیسیلیا سەری بۆ لەقاند. نەنكی لەماوەی پێشوودا زۆرێك لە ئینجیلی بۆ خوێندبووەوە، بەڵام ڕێك ئەو قسەیەی لەیاد نەبوو.
_ دە بیڵێ!
_ وتی "خوایە.. خوایە، بۆچی منت بەتەنها جێهێشت؟"

لەوێدا سیسیلیا لەپڕێکدا شتێکی بۆ ڕونبووەوە. قەت لەوەوپێش بیری لێنەکردبووەوە. ئەگەر مەسیح خودا بووبێت، کەواتە لەو کاتەدا کە هەڵیانواسی لەگەڵ خۆیدا قسەی کردووە. خۆ پێشیدەچێت ئەو کاتەش کە لە گێتسیمان[1]دا قسەی بۆ شاگردەکانی کردووە، هەر لەگەڵ خۆیدا قسەی کردبێت. لەو کاتەدا کە گرتیان، شاگردەکانی خەوتن و تەنانەت تاقەتی ئەوەشیان نەبوو بەخەبەربن.

سیسیلیا لەدوایەوە وتیەوە؛

_ "خوایە.. خوایە، بۆچی منت بەتەنها جێهێشت؟"

ئاریل هەر بە ئاسمانەوە کەمێک لە سیسیلیا نزیکبووەوە و بەچاوە یاقوتیەکەی تەماشای ناو چاوی کرد و وتی؛

_ بیڵێ سیسیلیا! دوبارە و چەندبارە بیڵێرەوە. چونکە شتێک لە گەردووندا هەیە کە تەواو نیە. شتێک لە سەرتاپای وێنەکەدا هەیە کە هەڵەیەکی تێکەوتووە.

سیسیلیا هەوڵیدا مێشکی سافبکات، ئینجا پرسی؛

_ بەڕاستی تۆ هیچ شتێکی زیاتر لەبارەی لاکەی ترەوە نازانیت؟

ئاریل کەللە ڕوتەکەی بۆ ڕاوەشاند؛

_ ئێمە هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکدا دەبینین. وا ئێستاکە ڕێگە بە تۆ درا کە لە شوشەکەوە نیگایەک بکێشیتە لاکەی ئەودیو. من ناتوانم هەموو ئاوێنەکە پاکبکەمەوە. گەر وامبکردایە ڕەمبێکم زیاترێکت بدیبایە، بەڵام ئەو کاتە چیتر لەتواناتدا نەدەبوو کە خۆت ببینیت.

سیسیلیا سەریسوڕما، سەیرێکی کرد و وتی؛

_ ئەوە ئەندێشەیەکی هەر زۆر قوڵ بوو.

ئاریل سەری بۆ لەقاند؛

_ ناتوانین لەوەندە زیاتر لە لەش و خوێندا قوڵ ببینەوە. چونکە لەش و خوێن ئاوێکی تەنکە. من بەردەوام لم و بەردەکانی ژێرەوەی دەبینم.

_ بەڕاستی وایە؟

ئاریل سەری بۆلەقاند؛

---

[1] گێتسیمان؛ ئەو باخچەیەیە کە مەسیحیان تێداگرت. و

_ ئێ خۆ لەش و خوێن هەر خۆڵ و ئاون و هیچی تر. بەڵام هەر ئەوەندەیە کە خوا فویەکی ڕۆحی خۆی پێداکردوون. هەر لەبەرئەوەشە کە شتێکی خوایانە لەناوەوەتاندایە.

سیسیلیا لەناچاریدا دەستی بەملاولادا ڕاوەشاند و وتی؛

_ نازانم چی بڵێم.

ئاریل وتی؛

_ پیرۆزبایی لە خۆت بکە.

_ ئێ خۆ ڕۆژی لەدایک بوونم نیە!

ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند؛

_ دەڵێم پیرۆزبایی لە خۆت بکە، چونکە تۆ مرۆڤێکیت و ڕێگەت پێدراوە بەدەوری خۆرێکی گەرمی گەردووندا، بەشداری سەفەرێکی سەرسوڕهێنەر بکەیت. لێرەدا تۆزقاڵێکی ئەبەدیەتت ئەزمونکردوە. تۆ تەماشای گەردوونت کردووە سیسیلیا! بەو شێوەیەش بوارت پێدراوە سەرت لەسەر ئەو پەڕەیە هەڵببڕیت کە وێنەی تۆی تێدا نەخشاوە و تەماشای سەرەوە بکەیت. بەو شێوەیە توانیت پاشای مەزنی خودی خۆت لەو ئاسمانە گەورەیەدا ببینیت.

ئاریل هێندە بە جدی قسەی دەکرد، سیسیلیا لە وشەکانی دەترسا. لەبەرئەوە وتی؛

_ پێموابێت وا باشترە کە هیچ شتێکی تر نەڵێیت. وابزانم لەوەندە زیاتر بەرگە ناگرم.

ئاریل وتی؛

_ هەر ئەوەندە!

ئینجا بە نیگایەک تەماشای ناو چاوانیکرد کە لە دەریای 'ئەدریاتیک' قوڵتر و ڕونتربوو؛

_ هیچ ئەستێرەیەک نیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دانەڕمێت. بەڵام خۆ ئەستێرەیەکیش تەنها پریشکێکی بچکۆلەی ئاگرە گەورەکەی ئاسمانە و هیچی تر..

چرکەی دوای ئەوە دیارنەما. دەشێ لە هەمان کاتیشدا سیسیلیا خەوی لێکەوتبێت. کە خەبەری بووەوە، دایکی و باوکی و نەنکی لەبەردەم جێگای خەوەکەیدا دانیشتبوون.

_ هەمووتان لێرەن؟

هەر سێکیان سەریان بۆ لەقاند. دایکی پەڕۆیەکی تەڕی دەهێنا بە دەمیدا.

_ ئەی لاس کوا.

_ لەگەڵ داپیرەدا چۆتە دەرەوە. خلیسکێنە دەکەن.

_ دەمەوێت لەگەڵ نەنکمدا قسەبکەم.

_ من و باوکت بەجێت بهێڵین؟

سیسیلیا سەرێکی بۆ لەقاند.

هەردووکیان بە هێواشی چوونە دەرەوە و نەنکی هەردوو دەستی گرت.

سیسیلیا لێی پرسی؛

_ لەبیرت دێت کە باسی 'ئۆدین'ت بۆ کردم؟

_ بێگومان لە بیرمە.

_ دوو داڵی گەورە بەسەر شانەکانیەوە بوون، هەر شانە و داڵێک. هەموو بەیانیەک هەڵدەفڕین بۆ ئەوەی شتەکانی جیهان ببینن و بزانن بە چ شێوەیەکن. دواتریش دەهاتنەوە بۆ لای ئۆدین و هەموو ئەو شتانەیان بۆ دەگێڕایەوە کە بینیبوویان..

نەنکی وتی؛

_ وا ئێستاکە تۆ چیرۆکەکەم بۆ دەخوێنیتەوە.

سیسیلیا هیچی تری نەگوت، لەبەرئەوە نەنکی بەردەوامی بە قسەکانیدا و وتی؛

_ بەڵام بە شێوەیەک لە شێوەکان ئۆدین خۆی بەملاولادا دەفڕی. ڕاستە لەسەر کورسیە درێژەکەی دادەنیشت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەیتوانی بە باڵی داڵەکانی بە هەموو جیهاندا بخولێتەوە. وەک دەزانیت داڵیش چاوی زۆر تیژە..

سیسیلیا قسەکانی پێبڕی؛

_ منیش ویستم ئەوە بڵێم کە..

_ کە چی؟
_ خۆزگە منیش دوو دالّی ئاوهام دەبوو. یان خۆزگە هەر هیچ نەبێت خۆم یەکێکیان بوومایە.
نەنکی کەمێک توندتر دەستەکانی وشی؛
_ پێویست ناکات باسی ئەو جۆرە شتانە بکەین.
سیسیلیا وتی؛
_ بەڕاست.. خەریکە هەموو ئەو شتانەم لەبیردەچێتەوە کە لەوەوپێش بۆت گێڕابوومەوە.
_ پێم وابێت هەر زۆر باش شتەکانت لە یادە.
_ تۆ وتت دڵمان تەنگ دەبێت کە شتێکی جوان دەبینین؟ یان وتت کە شتێکی غەمگین ڕوودەدات جوان دەبین؟
نەنکی وەڵامی نەدایەوە، هەروا مەچەکی گرتبوو تەماشای ناو چاوی دەکرد.
سیسیلیا وتی؛
_ دەفتەرێکی یاداشت لە ژێر جێگاکەمدایە. دەتوانیت بمدەیتێ؟
نەنکی دەستێکی بەردا، خۆی چەماندەوە و دەفتەری یاداشتە چینیەکەی لەژێر جێگاکەدا دەرهێنا. قەڵەمە گەورەکەشی دۆزیەوە.
سیسیلیا پرسیارێکی لێکرد و وتی؛
_ دەتوانیت شتێکم بۆ بنوسیت؟
لەوێدا دەستەکەی تریشی بەردا و سیسیلیا دەستی بە قسەکرد؛
_ "ئێمە هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکدا دەبینین، هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینین. هەندێ جار بۆ ساتێک دەتوانین لەناو ئاوێنەکەوە تەماشا بکەین و کەمێکی ئەو دیو ئاوێنەکە ببینین. هەڵبەتە ئەگەر ئاوێنەکە تەواو پاکبکەینەوە، زیاترێک دەبینین. بەڵام ئیتر ئەو کاتە چیتر خۆمان نابینین.."
نەنکی سەری لەسەر دەفتەری یاداشتەکە بەرزکردەوە و سیسیلیا لێی پرسی؛
_ ئەندێشەیەکی قوڵ نەبوو بەلاتەوە؟
نەنکی سەری بۆ لەقاند و چەند فرمێسکێک بەسەر کوڵمەکانیدا خزانە خوارەوە.

سیسیلیا وتی؛
_ ئەوە دەگریت؟
_ بەڵێ کچەکەم ئێستاکە دەگریم.
_ لەبەرئەوە دەگریت کە زۆر جوان بوو، یان لەبەرئەوەی کە زۆر غەمگین بوو؟
_ لەبەر هەردووکیان.
_ هێشتا قسەم ماوە بیڵێم.
_ بەئارەزووی خۆت بڵێ...
_ "ئەگەر من وێنەی شتێکم بکێشابایە و بمزانیبایە دواتر دەبێتە شتێکی زیندوو، ئەو کاتە نەمدەوێرا وێنەی هیچ شتێک بکێشم. قەت نەمدەوێرا ژیان بە شتێک ببەخشم کە نەتوانێت بەرەنگاری هەموو ڕەنگە پەرۆشەکانی تر ببێتەوە.."
ژورەکە بەتەواوەتی خامۆشبوو، ماڵەکەش هەروەها.
سیسیلیا لە نەنکی پرسی؛
_ پێت چۆنە؟
_ زۆر باشە..
_ دەتوانیت زیاترێک بنوسیت؟
نەنکی دیسانەوە گریایەوە، ئینجا سەری بۆ لەقاند و سیسیلیا وتی؛
_ "ئافەریدەی سەر زەوی و ئاسمان نهێنیەکی هێندە مەزنە کە نە مرۆڤی ئێرە و نە فریشتەکانی ئاسمانیش لێی تێدەگەن. بەڵام شتێک لە گەردووندا هەیە کە تەواو نیە. شتێک لە سەرتاپای وێنەکەدا هەیە کە هەڵەیەکی تێکەوتووە".
نەنکی سەری هەڵبڕی.
_ تەنها یەک شتی تر ماوە.
نەنکی دیسانەوە سەری بۆ لەقاندەوە و سیسیلیا وتی؛
_ "هیچ ئەستێرەیەک نیە کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دانەڕمێت. بەڵام خۆ ئەستێرەیەکیش تەنها پریشکێکی بچکۆلەی ئاگرە گەورەکەی ئاسمانە و هیچی تر".

***

پاش نیوەڕۆیەک سیسیلیا لەدەنگی تەیرەکانی دەرەوە خەبەری بووەوە. لەو کاتەدا دایکی لەتەنیشت جێگاکەیەوە دانیشتبوو.

سیسیلیا وتی؛

_ ئەوە بۆچی پەنجەرەکە کراوەتەوە؟

_ ئاخر ئاووهەوای دەرەوە هەر زۆر خۆشە، هەر دەڵێی بەهارە.

_ هەموو بەفرەکە تواوەتەوە؟

_ نا، نا، بەهیچ جۆرێک.

_ هێشتا سەهۆڵی سەر ڕووبارەکەش ماوە؟

سەرێکی بۆ لەقاند؛

_ بەڵام ئیتر متمانەی پێناکرێت خلیسکێنەی لەسەر بکەیت.
سیسیلیا بیری لە ئاریل دەکردەوە. دواجار کە لەلای بوو زۆر بە جدی قسەی لەگەڵدا دەکرد. بڵێیت هەر لەبەر ئەوە بووبێت کە دواهەمین نهێنی ئاسمانی لەلا درکاند؟
لەو ڕۆژانەدا بەردەوام یەکێک لەلای دادەنیشت. ئێوارەیەکیان سیسیلیا داوای لێکردن کە شەوەکەی هیچ کەسێک بەدیاریەوە نەبێت.
دایک و باوکی لەبەردەم جێگاکەیدا دانیشتبوون.
باوکی وەک ئەوەی دڵنیای بکاتەوە وتی؛
_ بەردەوام یەکێکمان لەلات دادەنیشین.
_ بۆ؟
کەس وەڵامی نەدایەوە، لەبەرئەوە وتی؛
_ ئێ ئەگەر شتێکم پێویستبێت زەنگێکتان بۆ لێدەدەم و تەواو.
باوکی دەستێکی هێنا بە قژیدا؛
_ ئاخر دڵنیانین لەوەی کە بتوانیت زەنگمان بۆ لێبدەیت.
_ گەر نەتوانم ئەوسا فریشتەیەک دەنێرمە لاتان تا خەبەرتان بکاتەوە.
دایک و باوکی سەیرێکی یەکتریان کرد. سیسیلیا وتی؛
_ خۆ پێتان وا نیە کە ڕابکەم؟
باوکی سەری بۆ ڕاوەشاند، بەڵام دایکی وتی؛
_ ئەو کاتەش کە منداڵ بوویت هەروەک ئێستاکە لەلات دادەنیشتین.
_ چیە لە پڕێکدا لەوە دەترسن تەیرەکە لە قەفەزەکەیەوە هەڵفڕێت یان چی؟
دواجار ناچاربوو نیمچە هەڕەشەیەکیان لێبکات تا ژورەکەی بەجێبهێڵن. پاش کەمێک کە خەبەری بووەوە، ئاریل لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانیشتبوو. وتی؛
_ تۆ زۆر جوانیت کە دەخەویت.
_ نامەوێت قسە بکەم، بەڵکو دەمەوێت بڕۆمە دەرەوە!
_ هێزی ئەوەت هەیە؟

_ هێز! بەرلەوەی سەهۆڵی سەر ڕوبارەکە بتوێتەوە، هەر دەبێت بچم و تەماشایەکی بکەم.
ئاریل هەناسەیەکی هەڵکێشا؛
_ ئاخر سەختە ئەو هەموو جلە لەبەربکەیت.
دیسانەوە سیسیلیا وتیەوە؛
_ بەڵام هەر دەمەوێت بڕۆمە دەرەوە.
_ باشە، پیاسەیەکی بچکۆلە دەکەین.
ئاریل یارمەتیدا و جلە زستانەکانی لە دۆڵابەکەدا بۆ دۆزیەوە.
سیسیلیا بەدەنگێکی دڵنیاوە وتی؛
_ ئەم شەو تاخورکەکە دەبەین.
ئاریل خەندەیەک گرتی؛
_ ئەمە یەکەمین جارە کە سواری تاخورک ببم.
سیسیلیا زیاترێکی وت؛
_ یان بەلایەنی کەمەوە ئەمساڵ ئەمە یەکەمین جارە.
پاش ئەوەی جلەکانی لەبەرکرد، بۆ ساتێک پێکەوە وەستان و سەیری بەردە بەنرخەکانی ناو کتێبخانەکەیان دەکرد.
سیسیلیا وتی؛
_ وابزانم بەردی هەموو وڵاتەکانی جیهانی تێدایە. هەر بەردێک لەوانە بەشێکی بچکۆلەی ئەم زەویەن.
ئاریل لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "بەشێکی بچکۆلەی ئەم زەویەن".
ئاریل پەنجەی بۆ ئەو پەپولەیە ڕاکێشا کە ماریانا بە دیاری بەخشیبووی بە سیسیلیا و وتی؛
_ خۆ ئەوەشیان وا نیە؟
وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە، بەڵام دەستیدایە پەپولەکە و خستیە گیرفانی قەمسەڵەکەیەوە. ئینجا وتی؛
_ ئێستاکە دەبێت بچێتە دەرەوە و بفڕێت.
ئاریل لاسایی کردەوە و وتی؛
_ "بچێتە دەرەوە و بفڕێت"، "ئێستاکە دەبێت بچێتە دەرەوە و بفڕێت".

_ لەپێشدا بڕۆ بزانە هەموویان خەوتوون یان نا.
ئاریل بە نیگایەکی مەکراویەوە سەیرێکی کرد و وتی؛
_ هەردووکمان بچین سەیر بکەین؟
هەردووکیان چوونە دالانەکەوە و تاخورکەکەیان لەسەر پلیکانەکان دانا. ئینجا بە ئەسپایی چوونە ژوری نوستنەکەی دایک و باوکیەوە. دەرگاکەیان کرابووەوە. هەردووکیان لەتەنیشت یەکەوە لەبەردەم دەرگاکەدا وەستان. سیسیلیا پەنجەیەکی خستە سەر دەمی و بە چرپەیەک وتی؛
_ شششششش..
ژورەکەیان تاریک بوو، بەلام کەمێک ڕوناکی گڵۆپی سەر ئەمبارەکە لە پەنجەرەکەیانەوە دەهاتە ژورەوە. دایک و باوکی زۆر نزیک بەیەک پاڵکەوتبوون.
ئاریل بە چرپەچرپێک وتی؛
_ تۆش پێت وا نیە کە دایک و باوکت لەو کاتەدا کە دەخەون لە منداڵ بچن؟
سیسیلیا سەری بۆ لەقاند؛
_ خۆزگە دەمزانی خەو بە چیەوە دەبینین...
چوونەوە ڕاڕەوەکە و خۆیانکرد بە ژورەکەی 'لاس'دا. کۆمەڵێک لیگۆی زۆری لەسەر عەرزەکە پەرشوبلاوکردبووەوە. سیسیلیا ناچاربوو زۆر بەوریاییەوە بچێتە پێشەوە تا قاچیان پێدا نەنێت. 'ئاریل'ش هەروا بەبەرزی چەند سانتیمەترێک لە زەویەکەوە بەهێواشی دەفڕی.
هەستیدەکرد برا بچکۆلەکەی زۆر خۆشدەوێت و چەند فرمێسکێکی لەناو چاویدا سڕی.
شتێکی سەیر نیە کە کەسێکمان خۆشدەوێت، فرمێسک بەچاوماندا دێتە خوارەوە؟ حەفتەی پێشوو هەر زۆر کەم لەگەڵیدا بوو و تاڕادەیەک هەروەک منداڵێکی نامۆ دەهاتە بەرچاوی.
تاخورکەکەیان هەڵگرت و بە هێواشی بە پلیکانەکاندا هاتنە خوارەوە بۆ قاتی یەکەم.
سیسیلیا هەر بە چرپە وتی؛

_ نەنکم و باپیرەم لە خانوە بچکۆلەکەی تەنیشتمانەوە دەژین.
ئاریل سەرێکی بۆ لەقاند و وتی؛
_ بەڵام ئا ئێستاکە نەنکت لەسەر قەنەفەکەی ژوری دانیشتنەکە خەوتووە.
چوونە ژوری دانیشتنەکە و قسەکەی ڕاست دەرچوو؛ نەنکی بە هەموو جلەکانی بەریەوە لەسەر قەنەفەکە خەوتبوو و بەتانیەکی بچکۆلەی بەخۆیدا دابوو. سیسیلیا دەیزانی کە لە ماوەی ڕابووردودا نەنکی چەند جارێک لەلایان مابووەوە و لەسەر قەنەفەکە دەخەوت. دایکیشی دەیوت "ئاخر لەبەرئەوەیە کە باپیرەت دەپرخێنێ و ئەویش خەوی لێناکەوێت". بەڵام خۆی دەیوت "بۆیە لێرە دەمێنمەوە بۆ ئەوەی لەدەرزی لێداندا یارمەتی دایکت بدەم".
سیسیلیا بەچرپەچرپ وتی؛
_ باشترین نەنکی هەموو دونیام هەیە.
ئاریل لەوەڵامدا وتی؛
_ دەزانم.
_ نەک هەر لەبەرئەوەی کە نەنکی منە، بەڵکو بەڕاستی باشترین نەنەی هەموو دونیایە.
ئاریل لاسایی کردەوە و وتیەوە؛
_ "باشترین نەنە".. "باشترین نەنەی هەموو دونیایە".
بەپلیکانەکانی بەردەرگادا چوونە خوارەوە و دەرگای دەرەوەیان لەدوای خۆیان داخست. شەوێکی زستانی سارد بوو. ئاسمان پڕبوو لە ئەستێرە و دەدرەوشانەوە و دونیایان ڕوناککردبووەوە. ئەو شەوە مانگ دیارنەبوو، لەبەرئەوە ئەستێرەکان زیاد لە ڕادە دەدرەوشانەوە. تەنها لەو کاتانەدا هەموو ڕووناکیەکەیان دەردەکەوت کە دونیا بەتەواوەتی تاریک تاریک دەبوو.
سیسیلیا تاخورکەکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا و بە حەوشەکەدا ڕایکرد. نەنکی پەتێکی ئەستوری بۆ پێوەکردبوو. هەرچەندە دایکی دەیوت پێویست ناکات پەلەی لێبکەین و پەتی پێوەبکەین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیسیلیا و نەنکی بەدزیەوە پەتەکەیان هەر پێوەکردبوو.

لەودیو حەوشەکەیانەوە گردۆڵکەیەکی لێژی لێبوو و لەو سەرەوەی تا لای نزیکی ڕوبارەکە دەڕۆیشت. سیسیلیا یەکسەر لەسەر تاخورکەکەی دانیشت. لەو کاتەدا کە بەرەوخوار بووەوە، ئاوڕێکی لە ئاریل دایەوە و وتی؛

_ ئەگەر دەتەوێت بێیت، خێرا سەرکەوە!

ئاریل دوای کەوت و ڕێک لە تەنیشتیەوە دانیشت. بەفرەکە بەستبووی، لەبەرئەوە بە خێراییەکی یەکجار زۆر بەرەوخوارەوە خلیسکان. تا لای دەوەنە چڕەکانی بەردەم قەراغ ڕوبارەکە نەوەستانەوە. سیسیلیا پێکەنی و وتی؛

_ ڕیکۆردمان شکاند!

هەستایە سەرپێ و ڕویکردە ئاریل؛

_ هەر زۆر خۆش نەبوو؟

ئاریل بەدەموچاوێکی کەمێک غەمبارەوە وەڵامی دایەوە و وتی؛

_ بێگومان.. بەڵام من هەستم بە هیچ نەکرد.

سیسیلیا بەدەنگێکی پڕ لە دڵنیاییەوە وتی؛

_ ئینجا دەچینە سەر ڕوبارەکە.

بەناو دەوەنەکاندا ڕۆیشت و چووە سەر سەهۆڵی بەستووی ڕوبارەکە. سیسیلیا وتی؛

_ پێڵاوی سەر سەهۆڵیان بەدیاری نەدامێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەسەر سەهۆڵەکەدا هەر خلیسکێنە دەکەم.

دەستی لە تاخورکەکەی بەردا و هەر بە پوتەکانی پێیەوە بەسەر سەهۆڵەکەدا کەوتە خلیسکێنەکردن. 'ئاریل'یش بەپێ پەتیەکانیەوە دوایکەوت. دیاربوو قاچەکانی زۆر لوسبوون، چونکە هەر کتومت وەکو سەماکەری سەر سەهۆڵ چەند جارێک خۆی بەئاسماندا هەڵدا و خولایەوە.

لەپڕێکدا سەهۆڵەکە درزیتێبوو و گوێیان لێبوو کە شاخەی لێهەڵسا. سیسیلیا بە ڕاکردن خۆی گەیاندە بەری ئەوبەر. ئاریل'یش بەهێواشی بەدوایدا ڕۆیشت.

ئاوڕیانداییەوە و ئینجا بینیان کە سەهۆڵەکە شەقیبردووە و بووە بە چەند پارچەیەکی گەورە گەورەوە. تاخورکەکەی لەسەر یەکێک لە پارچە سەهۆڵەکان لەناوەڕاستی ڕووبارەکەدا گیرسابووەوە. سیسیلیا هاواریکرد و وتی؛

_ تاخورکەکە!

پێویستی نەکرد لەوەندە زیاترێک بڵێت، چونکە ئاریل یەکسەر کەوتە ڕێ. سیسیلیا وایدەزانی بەسەر ڕوبارەکەدا دەفڕێ و لەئاسمانەوە دەست دەداتە تاخورکەکەی. کەچی کە گەیشتە قەراغ ئاوەکە، هەروا بەسەر پارچە سەهۆڵەکاندا ڕۆشت. لە هەندێ شوێندا بەسەر ئاوەکەشدا دەڕۆشت.

پاش نەختێک بەخۆی و تاخورکەکەوە گەڕایەوە. سیسیلیا باوەڕی بە چاوی خۆی نەدەکرد، بەڵام هەرلەوە دەچوو کە تاخورکەکەی بەسەر ئاوەکەدا بفڕێت، هەر لە دیمەنی گالیسکەکەی بابەنوئێل دەچوو کە ئاسکەکان بەئاسماندا ڕایدەکێشن.

سیسیلیا بەدەنگی بەرز وتی؛

_ ئافەرم!

دەستی دایە چمکێکی پەتەکەی و وتی؛

_ بابڕۆین سەرێک لە ماریانا بدەین!

بەخێرایی بەسەر گردەکاندا سەرکەوتن و بەرەوڕوی خانوە زەردەکە ڕۆشتن. چەند مانگێک لەوەوپێش سیسیلیا لەوێ بووبوو. چەند جارێکیش بەر لە جەژنی لەدایک بوونی مەسیح ماریانا سەردانی سیسیلیای کرد، بەڵام وا چەند حەفتەیەک بوو چاوی پێنەکەوتبوو.

پاش نەختێک لەبەردەم خانوەکەدا خۆیان بینیەوە. سیسیلیا دەستیدایە دەسکی دەرگاکە، بەڵام داخرابوو.

ئاریل وتی؛

_ کەواتە ناتوانین بچینە ژورەوە. هەڵبەتە من خۆم دەتوانم بەناو دەرگاکەدا بچمە ئەودیوەوە، بەڵام پێم باش نیە کە هەردووکمان ئەوە بکەین.

سیسیلیا خەندەیەکی مەکراوی گرتی. بەرەو ئەمبارەکە ڕۆشت و بەدەستی ئاماژەی بۆ ئاریل کرد کە دوای بکەوێت. بەدەنگێکی پڕلە شانازیەوە وتی؛

_ دەزانم کلیلەکە لە کوێدایە.

یەکسەر لە ژێر قتویەکی بەتاڵی بۆیاخدا دۆزیەوە. ماوەیەک لەوەوپێش هێندەی ماڵی خۆیان دەچووە ماڵی ماریانا.

دەرگای دەرەوەی کردەوە و بە هێواشی چوونە ژورەوە. بۆ ئەوەی بچنە ژوری خەوەکەی ماریانا، ناچاربوون بە ژوری دانیشتنەکەیاندا بڕۆن. سیسیلیا گڵۆپێکی لادیواری داگیرساند. 'ئاریل'یش هەروەک برایەکی بچکۆلە بەخێرایی بەدوایدا دەڕۆشت.

سیسیسلیا بە ئەسپایی دەرگای ژورەکەی کردەوە. ماریانا خەوتبوو و قژە سورە درێژەکەی بەسەر سەرینەکەیدا بڵاوبووبوەوە.

سیسیلیا هەمیشە هەستیدەکرد وەک تەیرێک سەربەست و ئاسودەبێت، بەڵام لەوێدا کە ماریانای بینی فرمێسکێکی بەچاودا هاتە خوارەوە. ڕەنگە لەبەرئەوە بووبێت کە خەوتبوو، یان پێدەچێت لەبەرئەوە بووبێت کە دەمێک بوو نەیبینیبوو.

_ دەگریت؟

_ بەڵێ، ئێستا دەگریم..

ماریانا خۆی لەسەر جێگاکەی هەڵگێرایەوە. لەوەدەچوو کە خەبەری ببێتەوە.

ئاریل قەمسەڵەکەی سیسیلیای ڕاکێشا و وتی؛

_ دە ئێستاکە ئیتر خواحافیزبوونی لێبکە!

سیسیلیا گیرفانی قەمسەڵەکەی کردەوە و پەپولە بچکۆلەکەی دەرهێنا. بەهێواشی و بەجوانی لەسەر عەرزەکە لەبەردەم جێگای خەوەکەی ماریانادا داینا.

ئاریل لێی پرسی؛

_ بۆچی دایدەنێیت؟ ئێ خۆ ئەو خۆی بە دیاری بۆی هێنایت.

سیسیلیا شانەکانی هەڵتەکاند و وتی؛

_ ئاااە.. گومانم نیە کە پێویستم نابێت.

چرکەی دوای ئەوە ماریانا لەسەر جێگاکەی بەرزبووەوە، بەڵام ئیدی سیسیلیا و ئاریل لەژوری دانیشتنەکەوە بەرەو دەرەوە دەڕۆیشتن. دەرگای دەرەوەیان بەدوای خۆیاندا داختەوە و سیسیلیا بەپەلە کلیلەکەی بردەوە ئەمبارەکە. ئینجا هەردووکیان لەسەر تاخورکەکە دانیشتن و ئەو ماوە کەمەی بەرەو ڕوبارەکە خلیسکێنەیان کرد.
پاش ئەوەی تاخورکەکە بەتەواوەتی وەستا، ئاریل بەرەو ئاسمان خۆی هەڵدا و هەروەک بوکەشوشەیەکی بێکێش بەچواردەوری سیسیلیادا دەخولایەوە. ئەویش هەر لەسەر تاخورکەکە دانیشتبوو و چاوی بڕیبووە ئەستێرەکانی ئاسمان. هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی؛
_ ئا ئەمەیە ئەبەدیەت.
ئاریلیش وتی؛
_ یان ئا ئەمەیە ئاسمان، یان بۆشایی ئاسمان.
سیسیلیا بەردەوام بوو و وتی؛
_ یان گەردوون.
ئاریل بۆی سەندەوە و وتی؛
_ یان جیهان.
ئیدی هەردووکیان پێکەنین.
_ یان گەردوون!
_ یان دونیا!
_ یان هەقیقەت!
_ یان کتومت ئەم جیهانە و هیچی تر!
دواجار سیسیلیا بەدەنگێکی بەرز وتی؛
_ یان نهێنیە گەورەکە!
ئاریل زۆر بەجدی سەری بۆ لەقاند و وتی؛
_ منداڵی بێ دایک و باوک ناوی زۆرە.
_ "منداڵی بێ دایک و باوک؟"
دیسانەوە سەری بۆ لەقاندەوە؛

_ منداڵی خۆشەویست هێندە ناوی زۆری نیە، بەڵکو منداڵی دۆزراوە ناوی زۆرە. ئەوانەی لەسەر پلیکانەکان دەیاندۆزنەوە. ئەوانەی کە کەس نازانێت خەڵکی کوێن. ئەوانەی هەروا لە بەتاڵیدا دەخولێنەوە.
دیسانەوە سیسیلیا وتیەوە؛
_ ئەمەیە ئەبەدیەت.
'ئاریل'ی فریشتە نیشتەوە خوارەوە و لەسەر تاخورکەکە لەلایەوە دانیشت. ئینجا وتی؛
_ ڕوونترین شێوەی ئەو ئەبەدیەتەش لە نیوەشەودا دەبینرێت.
سیسیلیا ڕوی تێکرد و شتێکی پێوت کە لەوەوپێش پێی وتبوو. بەڵام ئەم جارەیان وشە بەوشە دانی پێدانا و ڕونتر وتی؛
_ من تەنها ئەم کەرەتە لەم ژیانەدام و هەرگیزیش ناگەڕێمەوە بۆ ئێرە.
بەڵام ئاریل سەری بۆ ڕاوەشاند و وتی؛
_ تۆ ئێستاکە لە ئەبەدیەتدایت و ئەبەدیەتیش بۆ هەتاهەتایە هەر دەگەڕێتەوە.
چوونە خوارەوە بۆ لای قەراغ ئاوەکە و تەماشای پارچە سەهۆڵەکانیان کرد، ئاوەکە هێدی هێدی بەرەو دۆڵەکەی خوارەوە پاڵی پێوەدەنان. ڕوبارەکە بەدرێژایی زستان هێمن و ئارام وەستابوو، بەڵام وا لەناکاودا دەنگێکی تورەی لێبەرزبووەوە. تا لای پردەکە بەقەراغی ڕوبارەکەدا ڕۆیشتن و ئیدی چوونە سەر پردەکە تا بپەڕنەوە ئەوبەر.
لە ناوەڕاستی پردەکەدا ئاریل دەستی بۆ ئاوەکە ڕاکێشا و وتی؛
_ ناوی تەواوەتی ئەو ڕوبارە چیە؟
سیسیلیا لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "ناوی تەواوەتی ئەو ڕوبارە چیە؟".. ئێ خۆ چەند جارێک لەوەوپێش ناوەکەیم پێ وتیت. ناوی 'لیرا'یە.
ئاریل سەریکی بۆ لەقاند؛
_ ناوێکی جوانە و زۆر زەمینیشە، چونکە لەگەڵ بیستنی ئەو ناوەدا بەردەوام بیر لە تۆپەڵێک قوڕ دەکەمەوە کە لە شوێنێکدا بە ئارامی

مابێتەوە. بەڵام تەنانەت شتە هەرە زەمینیەکانیش لە ئاوێنەیەکی ئاسمانیەوە، دەبنە شتێکی ئاسمانی.
_ بە هیچ جۆرێک لێت تێناگەم.
ئاریل دیسانەوە وتیەوە؛
_ لیرا...
ئینجا خەندەیەکی پڕنهێنی خستە سەر لێوانی و وتی؛
_ تۆ هەموو شتێک لە ئاوێنەیەکدا دەبینیت، هەموو شتێک لە نهێنیەکدا دەبینیت.
سیسیلیا شانێکی بۆ هەڵتەکاند و 'ئاریل'یش وتی؛
_ دەتوانیت بە پێچەوانەوە 'لیرا' بخوێنیتەوە، هەر وەک ئەوەی لە ئاوێنەیەکدا بیبینیت؟
پاش چرکەیەک سیسیلیا بەدەنگی بەرز وتی؛
_ "ئاریل".. ئای، خۆ دەبێت بە 'ئاریل'.
ئاریل بە شانازیەکەوە سەری بۆ لەقاند؛
_ من هەمیشە لەم دۆڵەدا باشم گوزەراندووە.
سیسیلیا هەر زۆر سەریسوڕمابوو.
بەرەو 'سکۆتبو' سەرکەوتن، لەو ڕێگایەدا سیسیلیا چەند جارێک سەری وەرچەرخاند و سەیری گەردوونی کرد.
لە پڕێکدا چاویان لە ئەستێرەیەک بوو کە کشا. ئاریل دەستی بەدەمیەوە گرت و وتی؛
_ وا ئەستێرەیەک دەکەوێت.
سیسیلیا لەدوایەوە وتیەوە؛
_ "ئەستێرەیەک دەکەوێت".
دیسانەوە خەیاڵی چووەوە سەر ئەستێرە کۆنەکەی سەر دار سنەوبەرەکەیان کە لە پڕێکدا ونبووبوو. بەڕاست.. ئاریل خۆی کەڕەتێکیان نەیوت 'دەزانم لە کوێدایە'؟
سیسیلیا تاخورکەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا و بۆ سەرەوە بەرەو ئەمبارە سورەکەی 'سکۆتبو' دەڕۆشتن، لەو کاتەدا کە دواهەمین بەشی ڕێگاکەی بڕی، ئاوڕی لە ئاریل دایەوە و پرسی؛

_ بیرت دێ باسی ئەستێرە کۆنەکەی سەر دارسنەوبەرەکەمانم بۆ کردیت و وتم لە ناکاودا بە شێوەیەکی نهێنی لێمان ونبووە؟
سیمایەکی پڕنهێنی کەوتە سەر دەموچاوی ئاریل و وتی؛
_ مەرج نیە بە شێوەیەکی نهێنیش ونبووبێت.
_ ڕاستە! چونکە تۆ ڕێک دەزانیت لە کوێدایە.
سیسیلیا سەرمابیوو. ئاریل مەبەستی چیبوو کە وتی مەرج نیە بەشێوەیەکی نهێنی ونبووبێت؟ ئەی ئەگەر هەر لە سەرەتاوە دەیزانی لە چ شوێنێکدایە، بۆچی زوتر شوێنەکەی پێنەگوت؟
گەیشتنە ئەو سەری حەوشەکەوە و ئاریل ئاماژەی بۆ پشتی ئەمبارەکە کرد و وتی؛
_ وەرە ئێرە.
بەپاڵ دیوارەکەوە چەند لقوپۆپێکی دارێکی وشبوو دەرکەوتبوو. نزیکەی هەموو گەڵادەرزیلەکانی کەوتبوون. ئەو کەمەشی کە پێوەی مابووەوە ڕەنگێکی قاوەیی کاڵی گرتبوو. بەئاشکرا دیاربوو کە بەدرێژایی زستان دارەکە لە ژێر بەفردا مابووەوە. بەڵام ئیتر بەفرەکە هێواش هێواش خەریک بوو دەتوایەوە و دارە وشکبووەوەکەش دەرکەوتبووەوە.
سیسیلیا بەدەنگێکی بەرز وتی؛
_ خۆ ئەوە دار سنەوبەرەکەی ساڵی پارە!
ئەوەشی بیرکەوتەوە کە ساڵی پار خۆی و باوکی دارەکەیان ڕێک لەویادا دانا.
ئاریل کەمێک شەقی لە بەفرەکە هەڵدا و دارسنەوبەرەکەی بەتەواوەتی لەناو بەفرەکەدا دەرهێنا. لەوێدا سیسیلیا چاوی بە ئەستێرە کۆنەکە کەوت. هێشتا هەر بە ترۆپکی دارسنەوبەرەکەوە بوو. سەیربوو کە لەوەوپێش خەیاڵی بۆ ئەوە نەچوبوو! سەیربوو کە هیچ کەسێکیان خەیاڵی بۆ ئەوە نەچوبوو کە ساڵێ پار لەو کاتەدا شتەکانیان لە دارەکە کردبووەوە، ئەستێرەکەیان لەبیرچووبوو!
دارە وشکبووەکە غەمگین و بێکەس دەهاتە بەرچاو. سیسیلیا یەکسەر خەیاڵی چووە سەر قەراغ ئاوەکەی دورگەی 'سانتۆرینی'. تەنها

ئەستێرەکە وەک خۆی مابووەوە. بەفر و سەرمای زستان هیچ زەرەرێکی لێنەدابوو. هیچ نەگۆڕابوو و بەتەواوەتی وەک خۆی مابووەوە.
ئاریل خۆی چەماندەوە، پەنجەیەکی دا لە ئەستێرەکە و ڕووناک بووەوە، هەردەتوت کارەبای تێدایە.
سیسیلیا حەپەسا و وتی؛
_ ئای کە جوانە!
هەرکە ئاریل پەنجەی لەسەر لادەبرد، یەکسەر دەکوژایەوە.
سیسیلیا وتی؛
_ ئادەی کەرەتێکی تریش پەنجەی لێبدەرەوە.
کەرەتێکی تریش پەنجەی لێدایەوە. هەر ئەوەندەی کە پەنجەی بەردەکەوت، یەکسەر دادەگیرسا و ڕوناکیەکەی دەیدا لە ئاریل و سیسیلیا و دیواری ئەمبارەکە و بەفرەکەی چواردەوریان.
ئاریل دەستێکی بۆ سیسیلیا ڕاوەشاند و ئەویش یەکسەر زانی کە دەبێت بەپەلە بڕۆنەوە ژورەوە بەرلەوەی کەسێکی ماڵەکە خەبەری ببێتەوە.
ئەو جارەشیان ئاریل یارمەتی دا و خستیەوە جێگاکەی. تاخورکەکەی هەروەک پێشوو ڕێک لە شوێنی خۆیدا هەڵسپاردەوە. ئینجا هەر بە فوو هەموو ژورەکەی لە بەفر و پیسی پێڵاوەکانی پاککردەوە. سیسیلیا سەری کردە سەر سەرین و دەماودەم خەوی لێکەوت.
کە خەبەری بووەوە باوکی و نەنکی لەلای دانیشتبوون.
سیسیلیا لێی پرسین؛
_ شەوە؟
باوکی سەری بۆ لەقاند و دەستی گرت، نەنکیشی کەوتە تەڕکردنی لێوەکانی.
سیسیلیا بە چرپەچرپێک وتی؛
_ من دەزانم ئەستێرە کۆنەکەی دار سنەوبەرەکە لە کوێدایە؟
نەنکی و باوکی تەماشایەکی یەکتریان کرد و باوکی وتی؛
_ ئەستێرەی دار سنەوبەرەکە؟

سیسیلیا سەری بۆ لەقاند؛
_ لە پشتی ئەمبارەکەوەیە. پار لە بیرمان چووبوو لەگەڵ شتەکانی تردا لە دارەکەی بکەینەوە.
بەرلەوەی دیسانەوە خەوی لێبکەوێتەوە، سەیرێکی نەنکی کرد و تا لەتوانایدابوو چەند وشەیەکی بەشێوەیەکی بەرز و ڕوون وت.
هەردەتوت پارچە شیعرێکی لەبەرە و دەیخوێنێتەوە.
_ "منداڵی خۆشەویست هێندە ناوی زۆری نیە، بەڵکو منداڵی دۆزراوە ناوی زۆرە. ئەوانەی لەسەر پلیکانەکان دەیاندۆزنەوە. ئەوانەی کە کەس نازانێت خەڵکی کوێن. ئەوانەی هەروا لە بەتاڵیدا دەخولێنەوە".

***

لەناکاودا سیسیلیا خەبەری بووەوە و چاوی داپچری. ئاورێکی لە باوکی دایەوە، ئەو لەسەر کورسیەکەی تەنیشت جێگاکەی دانیشتبوو و ئەستێرە کۆنەکەی بەدەستەوە بوو.
لەرادەبەدەر دڵی بەوە خۆشبوو کە باوەڕیان پێکردووە، هەرچەندە خۆشی نەیدەزانی بۆ ئەوەندە دڵێ بەوە خۆشبوو. بەڕاستی چووبوونە پشت ئەمبارەکەوە و ئەستێرەکەیان دۆزیبووەوە. ڕێک چووبوونە ئەو شوینەی کە سیسیلیا و ئاریل دوێنێ شەو لێی بوون.
سیسیلیا بە بڵمەبڵمێکەوە وتی؛
_ لەو شوێنەدا دۆزیتانەوە کە من پێموتن.
سەخت بوو بەلایەوە کە وشەکان بەتەواوەتی بڵێت.
باوکی ئەستێرەکەی خستەسەر لێفەکەی. ئینجا بە چرپەچرپێک وتی؛
_ تۆ چۆن زانیت کە لەوێدایە؟
سیسیلیا ویستی خەندەیەک بخاتە سەر لێوەکانی؛
_ فریشتەیەکی خوا ئەوەی پێی وتم.
_ بەهەرحاڵ ڕێک لەو شوێنەدا دۆزیمانەوە کە تۆ وتت.
_ بەڵام ناتوانن دایبگیرسێنن. تەنها خوا دەتوانێت ئەوە بکات.
لەوێدا دایکی و نەنکی هاتنە ژورەکەوە. دواجاریش باپیرەی خۆیکرد بە ژوردا. دیاربوو هەموویان لەو دیو دەرگاکەوە وەستابوون و هەرئەوەندەی کە سیسیلیا باسی فریشتەیکرد و وتی 'فریشتەیەک یارمەتیدام'، یەکسەر هاتنە ژورەوە.
سەرێکی هەموویانی کرد. ئەمڕۆ مێشکی هەر زۆر ڕوونبوو، دەمێکبوو ئاوها نەبوو، بەڵام هەر ئەوەندەبوو کە زۆر لاوازبوو..
دوو کورسی لەبەردەم جێگاکەیدا بوون. دایکی لەسەر کورسیە بەتاڵەکە دانیشت، نەنک و باپیرەشی بە پێوە وەستابوون و تەماشایان دەکرد. لەناو هەر چواریاندا تەنها نەنکی خەندە لەسەر لێوی بوو.
دایکی لێی پرسی؛
_ دەتەوێت 'لاس' ببینیت؟

سیسیلیا سەری بۆ لەقاند و نەنکی چووە دەرەوە تا لاس بهێنێت. ناچاربوو بە پاڵ بیهێنێتە ژورەوە، چونکە زۆر شەرمن بوو.
لاس وتی؛
_ چۆنیت؟
_ تۆ چۆنیت لاس؟
سیسیلیا سەرێکی هەڵبڕی و وتی؛
_ پێڵاوی خلیسکێنەکەت چۆنە؟
_ زۆر باشە..
کەس هیچ شتێکی نەگوت، لەبەرئەوە سیسیلیا هەوڵیدا شتێکی هەزەلی بلێت؛
_ بەڕاستی هەقی خۆیەتی کە ژورەکەت ڕێک بخەیت، هەی بێسەروبەر!
هەرچەندە شتێکی هێندە هەزەلی نەگوت، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەموویان خەندە گرتنی. جگە لە سیسیلیا هیچ کەسێکی تریان نەیدەزانی کە دوێنێ شەو لەژورەکەیدا بووە.
سیسیلیا وتی؛
_ ئێستاکە سەهۆڵی ڕوبارەکە شەق دەبات.
هەموویان سەریان بۆ لەقاند و بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون.
هەر لەوەدەچوو وشەکانی دوا ڕستەی خۆی لە گوێیدا بزرەنگێنەوە "ئێستاکە سەهۆڵی ڕوبارەکە شەق دەبات"... "ئێستاکە سەهۆڵی ڕوبارەکە شەق دەبات".
نەنکی وتی؛
_ چەند باشبوو کە دیسانەوە ئەستێرە کۆنەکەی دار سنەوبەرەکەمان دۆزیەوە. هەموومان چووینە پشت ئەمبارەکەوە.
"هەموومان چووینە پشت ئەمبارەکەوە"
باشبوو چوون! هەموویان. هەر ڕێک وەکو ئاریل و سیسیلیا لەناو بەفرەکەدا بەدوایدا گەڕابوون.
سیسیلیا وەک ئەوەی شانازی بەخۆیەوە بکات وتی؛
_ بەلام پەپولەی تاکە نادۆزنەوە، چونکە تازە بەڕێی خۆیدا فڕی.

دایکی لەسەر کورسیەکەی بەرزبووەوە و هەنگاوێکی نا. ویستی بچێتە لای کتێبخانەکە و پەپولەکە بدۆزێتەوە.
بەڵام بەرلەوەی بگاتە ئەوێ، نەنکی بانگیکرد و وتی؛
_ 'تۆنە'..
ئینجا بەدەست ئاماژەی بۆکرد کە دابنیشێتەوە.
دیسانەوە بۆ ماوەیەکی زۆر هەمووان بێدەنگبوونەوە.
سیسیلیا بەلایەوە سەیربوو کە مێشکی هێندە کراوە و تیژبوو و لەهەمان کاتیشدا هەر حەزیدەکرد بخەوێت.
بەچرپەیەک وتی؛
_ وابزانم دیسان دەخەومەوە.. لەبەرئەوە دەمەوێت بڵێم جارێ 'کاتێکی خۆش'...

کاتێک کە کەمێک دواتر خەبەری بووەوە، پەنجەرەکە کرابووەوە و کەسیش لەسەر کورسیەکەی بەردەم جێگای خەوەکەی دانەنیشتبوو.
چرکەیەک دوای ئەوە ئاریل لەپەنجەرە کراوەکەوە خۆیکرد بە ژورەکەیدا. لەسەر مێزی نوسینەکەی دانیشت. سیسیلیاش لە جێگاکەیدا هاتە دەرەوە و بەپێوە بۆی وەستا. دواتر لێی پرسی؛
_ دیسانەوە هاتیتەوە؟
ئاریل ڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە؛
_ حەزدەکەیت پیاسەیەکی بچکۆلە بە ئاسماندا بکەین؟
سیسیلیا پێکەنی و لەوەڵامدا وتی؛
_ ئێ خۆ خۆت دەزانیت کە من ناتوانم بفڕم.
ئاریل بەسەبرەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی؛
_ ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کە واز لەو قسە قۆڕانە بهێنیت. فەرموو وەرە ئێرە.
ئینجا سیسیلیا بەرەو لای ئاریل ڕۆشت.
ئاریل دەستی گرت. چرکەی دواتر لە پەنچەرەکەوە چوونەدەرەوە و بەئاسماندا فڕین، بەسەر ئەمبارەکە و هەموو ئەو ناوچەیەدا فڕین.

بەیانیەکی زووبوو، ڕێک پێش ئەوەبوو کە خۆر هەڵبێت و ڕۆژێکی تری زستان دەست پێکات.
سیسیلیا وتی؛
_ ئای کە خۆشە! لەڕادەبەدەر خۆشە!
فڕینەکەی زۆر لەوە خۆشتربوو کە مەزەنەی دەکرد. ختوکەی دەهات کە تەماشای ترۆپکی دار سنەوبەرەکانی خوارەوەی دەکرد. کە سەریشی بەرزدەکردەوە، بە هەموو ئاڕاستەیەکدا شوێنە دورەکانی دەدی. پەنجەی بۆ 'گاردەمۆون' و 'هێکسەبێرگۆسن' و 'هوردالسیون' و 'میوسە' ڕاکێشا. جگەلەوەش لەدوری دورەوە ئاودڕی ئۆسلۆی دەدی و کەمێکی دەریاشی دەهاتە بەرچاو.
لەبەرزیەکی زۆرەوە بەسەر 'ڕاونەکۆلن'دا دەفڕین. لەوێوە هەر لە کلۆ شەکرێک دەچوو.
سیسیلیا وتی؛
_ ئێستاکە ڕێک وەک داڵە گەورەکانی 'ئۆدین'ین.
ئاریل وەڵامی دایەوە؛
_ ڕاستدەکەیت. کاتێکیش کە چووینەوە سەر دەستی ڕاستی خوا، هەموو ئەو شتانەی بۆ دەگێڕینەوە کە بینیومانە.
کەمێک دواتر فڕینەوە بۆلای پەنجەرە کراوەکەوە و لەسەر قەراغی پەنجەرەکە دانیشتن، هەر ڕێک وەک ئەو کاتەی کە ئاریل بۆ یەکەمین جار هاتە لای.
هەردووکیان سەیری جێگای خەوەکەیان دەکرد. سیسیلیا بە هیچ شێوەیەک بەلایەوە سەیرنەبوو کە خۆی لەسەر جێگاکە بینی، هەروا بە قژە کاڵەکەیەوە لەسەر جێگاکە پاڵکەوتبوو. ئەستێرە کۆنەکەی دار سنەوبەرەکەشیان لەسەر لێفەکەی دانابوو.
سیسیلیا وتی؛
_ ڕاستدەکەیت.. من جوانم کە دەخەوم.
ئاریل بەتوندی دەستی گوشی. تەماشایەکی کرد و وتی؛
_ لێرەدا کە دانیشتوویت، زۆر جوانتریت.

_ بەڵام من خۆم ناتوانم ئەوەیان ببینم، چونکە ئێستاکە من لەودیوی ئاوێنەکەوەم.
لەدوای ئەو وشانەیەوە ئینجا ئاریل دەستی بەردا و وتی؛
_ هەر لە پەپولەیەکی شۆخ و شەنگ دەچیت کە لە دەستی خواوە هەڵفڕیبێت.
سیسیلیا سەیرێکی ئەملاولای ژورەکەی کرد. گورزێک تیشکی ڕوونی ئەو بەیانیە دەیدا لە مێزی نوسینەکە و عەرزەکە. هەندێ تیشکیش دەیدا لە ژێر جێگاکەی سیسیلیا و خۆیان گەیاندبووە دەفتەری یاداشتە چینیەکەی. لەبەرچاوی سیسیلیادا هەموو تاڵە ئاوریشمیەکانی دەفتەرەکە دەدرەوشانەوە و دەبریقانەوە.

**سوپاسی بێپایانی هونەرمەندی هاوڕێم "سالار مەجید" دەکەم، کە بەرگی ئەم ڕۆمانەی نەخشاند.. بەڕاستی دیسانەوە دەستڕەنگی و گەورەییت سەرسامی کردمەوە... بەهرۆز حەسەن**